# ئاسایشی نەتەوەیی و پلانی زمان

## (روانینێك)

**د. قەیس كاكل تۆفیق**

كۆلیژی پەروەردە- سۆران



هەولێر - ٢٠٠٧



**ناوی كتێب: ئاسایشی نەتەوەیی و پلانی زمان**

- نووسینی: د. قیس كاكل تۆفیق
- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ( ٤١٨ )
- تیراژ: ( ٥٠٠ ) دانە
- چاپی یەكەم ٢٠٠٧
- نرخ: ( ١٥٠٠ ) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی دەزگای ئاراس

زنجیرەی كتێب ( ١٤ )



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوكردنەوەی موكریانی**
**www.mukiryani.com**
**asokareem@ maktoob.com**
**Tel: ٢٢٦٠٣١١**

## پێرست

## پێشەکی

باوەرم وایە کە ناسیۆنالیزمی کوردی (چ وەکو پارت یان وەکو تاکەکانی ناو پارت و رێکخراوەکان) لە هەمووکەس زیاتر لە خەمی بەرژەوەندیە نەتەوییەکانی کورد دایە ئەمەش پیاهەڵدان یان موجامەلە نییە، جونکە ئەرکیان ئەوەیە و پێویستە وابێ، هەر ئەوەشە وای کردووە کە سەدان و هەزاران قوربانی و شەهید لەم پێناوە بدەن، تەنانەت رێژەیەك لە تاکەکان رەنگە لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و خۆ دەوڵەمەند کردن بیر لە ئاسایشی نەتەوەیی و پێشخستنی کۆمەڵگا و داهێنان لەو بوارانەی کە کاری تێدا دەکەن نەکەنەوە، بەڵام ئەم کەسانەش بەرهەمی ئەو هەستە نەتەوەییە دەخۆن و هەر ئەو هەستەشە ئەوانی گەیاندۆتە ئەم شوێنە. بۆیە ئەوانەش نکۆڵی لە دڵسۆزی خۆیان بۆ دوارۆژی نەتەوەی کورد ناکەن. یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی نەتەوە زمانە، ئایا دەسەڵاتی کوردی لە ماوەی ئەو پازدەساڵەی ئازادیدا چ هەنگاوێکی هاوێشتووە بۆ دورستکردنی زمانی کوردی، یان چ پرۆژەیەکی ستراتیجی لە بەردەستدایە کە لە داهاتوودا بە پیرۆزی بگا؟

زۆر جار وابیر دەکەمەوە کە ئەوانەی لە مەڵبەندی دەسەڵاتن مرۆڤی سیاسین و خەریکی سیاسەتن، زانیاریان لە بارەی زمانەوانی و پلانی زمانی Language Planinng نییە، ئەمەش شتێکی ئاساییە، بۆیە هەق نییە ئەو گلەییەیان لێ بکرێ کە بۆچی لە بواری زماندا هەنگاوی پێویستیان نەهاوێشتووە. ئەم گلەییە پێویستە روو بەرووی زمانەوانەکان بکرێتەوە. بەلایەنی کەمەوە پێویستە بۆ بڕیاربەدەستەکان و ئەوانەی لە سەنتەری بریار کار دەکەن پرۆژە پێشکەش بکەن، تا ئەوان جێبەجێی بکەن. بەڵام کاتێك کە بیر لەوە دەکەمەوە سەرکردەیەکی وەك مستەفا بارزانی کە ئەویش مرۆڤێکی سیاسی و عەسکەری بوو نەك زمانەوان



بەڵام بۆچوونی لە زۆر زمانەوانی ئەمرۆ چاکتر بوو لە بەرامبەر زمانی یەکگرتووی کوردیدا. ئەوە بوو کە بە ناراستەوخۆ داوایان لێکرد کە دوو ستاندەر دورست بکرێ، بە توندی دژایەتی کرد و رێگای ئەم هەوڵەی نەدا.کاتێك کە ئەو هەڵوێستەی بارزانی دێنمە بەر چاو ئەوا سیاسییەکان دەکەمە بەرپرسیاری یەکەم و گلەییەکە دەخەمەوە ئەستۆی ئەوانەوە.

ئەم کتێبەی بەر دەستت هەندێك بۆچوونە، بە پێویستم زانی بیخەمە بەر دەست بۆ ئەوەی دەسەڵاتی کوردی ئاگادار ببێتەوە لە هەندێك مەترسی و بەرنامەی ستراتیژی دارێژێ. بەلایەنی کەمەوە بیخاتە ناو بەرنامەی کاری خۆیی و هەر بەتەمای خوا لێی نەگەرێ. بۆیە ئەم کتێبە بۆ ئەو کەسانە نوسراوە کە لە سەنتەری بریار کار دەکەن و دەشێ زمانەوانەکانیش گفتوگۆی زیاتر لەسەر بکەن و دەوڵەمەندتری بکەن.

**د. قەیس کاکل**

٢٠٠٧/٣/١٠

## بەشی یەکەم (زمان و نەتەوەی کورد)

### زمان لە دیدی زمانەوان و هەستی نەتەوەییدا

دەشێ لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە سەیری زمان بکرێ یەکێکیان ڕوانگەیەکی زمانەوانیە، کە تێیدا زمان تەنێکی بێ لایەنەو کەرستەیەکی خاوە، زمانەوان بەشێوەیەکی بابەتیانە لێی دەکۆڵێتەوە ئەم زمانەش گەشەو گۆڕان و سروشتی تایبەتی خۆی هەیە و هۆکاری ناوەکی و دەرەکی کاری لێدەکا گۆڕانەکان بەشێوەی ئەرێ یان نەرێ بێت، ئەوا زمانەوان بە سروشتی دەبینێ و خەم بۆ تێکچون و گۆڕانەکان ناخوات و بە پێشکەوتنیشی دڵخۆش نابێت. لەم ڕوانگەیەدا زمان نەشیرینە و نەپیرۆزە و نەپێویستی بە خزمەت کردن هەیە، چونکە زمان تەنیا بریتیە لە هۆیەکی لە یەکتر گەیشتن یان کۆمەڵە ڕەمزێکی لەخۆوەیە جا ئەم ڕەمزانە هەر چۆنێك بێت، گرنگ ئەوەیە کردەی تێگەیشتن ئەنجام بدات.

بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی هەستی نەتەوەییەوە سەیری بکرێ، ئەوا زمان دەبێتە پێناسەی نەتەوەو بە بەشێك لە ئاسایشی نەتەوەیی دادەنرێ، تەنانەت پیرۆزی و خۆشەویستی و شیرینی زمان دەگاتە ڕادەیەك کە تاکەکانی نەتەوە لە پێناوی دا دەبێتە قوربانی و شۆڕش بۆ بەکارهێنانی دەگێڕن. زمانی کوردیش نموونەیەکی زەقی ئەم دیاردەیەیە. ئەم سەیرکردنە بەچاوی ڕێزو پیرۆزەوە نەك هەر لەلای کورد کە نەتەوەیەکی بێ کیانە، تەنانەت ئەو نەتەوانەی کە هیچ ترسێك لەسەر کیانەکەشیان نییە هەر بە پیرۆزی سەیری زمانەکەیان دەکەن و سازشی لەسەر ناکەن. کۆڕی زانیاری و چەندین دەزگای تایبەتیان هەیە بۆ ئاراستەکردنی زمان بەو ئاراستەیەی کە لە بەرژەوەندی زمان و نەتەوەکەیاندایە، بۆ نموونە د. پەشێو



دەڵێت ((تا ئێستا لەچەند موناسەبەیەکدا هەوڵمداوە لەگەڵ نووسەرانی... وڵاتانی تری یەکێتی سۆڤیەت بە ڕووسی بدوێم، بەڵام چەند تەڵەی تەقیو دەم دەکاتەوە، ئەوانیش هەر هێندە! ئەگەر چی دەزانم کە لەناویاندا کەس نیە لەسەردەمی سۆڤیەتدا ژیابێ و ڕووسی نەزانێ))[1]. یان لە وڵاتێکی وەك ئەڵمانیادا کە بەزمانی ئینگلیزی پرسیار لە ئەڵمانیەك بکەیت ئەگەر ئینگلیزیش بزانێ ئەوا بە ئینگلیزی وەڵامت ناداتەوە. فەرەنسییەکانیش لە مێژە ململانێ لەگەڵ زمانی ئینگلیزی دەکەن، ئەو ململانێیە خراوەتە هەموو بوارەکانی ژیان، هەتا لە ژیانی ڕۆژانەشیاندا دان بەوە نانێن زمانی ئینگلیزی زمانێکی جیهانییە.

### کورد و زمانی نووسین

ئەگەرچی کورد لە مێژە لەو ناوچەیەدا دەژی و شارستانییەتی تایبەت بەخۆی هەبووە، بەڵام بەهۆی بارودۆخی سیاسی و ژێردەستەیی و نەبوونی کیانێکی سەربەخۆ لەلایەکی تریشەوە زاڵبوونی هەستی ئایینی بەسەر هەستی نەتەوایەتیدا وایکردووە کە نووسین بەزمانی کوردی لە کوردستاندا دوابکەوێت، تا ئەم دواییە زمانەکەیان بۆ نووسین بەکارنەهێنن. وەك خۆرهەڵاتناسەکان دەڵێن: تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمیش لەناو کورددا سێ زمان بەکاردەهات، زمانی عەرەبی بۆ کاروباری ئایینی، زمانی فارسی بۆ ئەدەبیات و زمانی تورکیش بۆ کاروباری میری. ئینجا دوای ئەو زمانانە زمانی کوردی بە پلەی چوارەم دەهات. تەنانەت ئەگەر کوردێك نامە بۆ برایەکی یان بۆ باوکی بنوسیبایە، ئەوا بەزمانی کوردی نەی دەنووسی، بەڵکو بەیەکێك لەو سێ زمانە دەینووسی. واتە زمانی کوردی لەسەدەکانی ڕابردوودا تەنیا بە زمانی ڕەش و ڕووت و نەخوێندەواران دانراوەو ئەو پلەیەی وەرنەگرتووە، کە بچێتە ڕیزی

[1]- د. عەبدوڵڵا پەشێو، چەند سەرنجێکی سەرپێیی دەربارەی میدیاو زمان، ڕۆژنامەی میدیا، ژمارە ٩١، ڕێکەوتی ٢٠٠١/٤/٧.

زمانی نووسین. هەر بۆیەش زمانەکانی دەوروبەر تەنگیان پێهەڵچنیوە و بواری بەکارهێنیان نەداوە تاوەکو بە پێی پێویست وشە و زاراوە دابتاشێ و گەشە بکات و دەوڵەمەند بێ.

## ڕۆڵی زمانی کوردی لە پاراستنی کیانی کوردیدا

ئەگەرچی زمان هۆیەکە بۆ لەیەکتر گەیشتن، بەڵام لەلای کورد بۆتە سەنگەرێکی بەهێز بۆ بەرگری کردن لە توانەوەو لەناوچوونی نەتەوەی کورد، وەك ئاشکرایە نەتەوەی عەرەب پێش پەیدابوونی ئیسلام لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا دەژیان و وڵاتەکەیان ئەوەندە فراوان نەبوو. تەنانەت لە باشووری ئەواندا واتە یەمەنی ئێستا، عەرەبی لێ نەدەژیا، بەڵکو وڵاتی حەبەشییەکان بوو، کە جیاوازن لەگەڵ عەرەب. لە شام واتا سوریا و ئوردن فەلەستینی ئێستا، ڕۆم و بێزەنتینییەکان دەژیان، لە عێراقدا فارس و کورد هەبوون. میسریش قیبتیەکانی تێدا دەژی. هەروەها وڵاتانی باکووری ئەفریقیاش خێڵی بەربەرییەکانی لێ دەژیا. ئەمانە هیچیان عەرەب نەبوون و نەتەوەی تر بوون. بەڵام لە دوای پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەعەرەبکردن کە لە سەردەمی ئەمەوییەکانەوە دەستی پێکرد[1]. بە ماوەیەکی کەم ئەم نەتەوانە ئاسەواریشیان نەماوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ئەمانە هەموویان خۆیان بە نەتەوەی عەرەب دادەنێن و هاوهەستن لەگەڵ عەرەبدا. هۆکاری توانەوەی ئەم نەتەوانەو لەناوچوونیان وەك نەتەوە ئەوە بوو، کە بەئاسانی سەنگەری زمانیان داگیرکرا، ئیتر کە زمانیش داگیرکرا ئەوا بەها نەتەوایەتییەکانی تر ئەو نرخەیان نامێنێ، کە نەتەوەی پێ بپارێزێ نەمانی

[1]- یولیوس فلهاوزن: تاريخ الدولة العربية الاسلامية من ظهور الاسلام الى نهاية الدولة الاموية، نقلة من المانية د. محمد عبدالهادي، راجع الترجمة، د.حسين مؤنس، القاهرة، ١٩٥٨: ٣٨٠.

هەروها بروانە: الشيخ محمد خضرى بك، محاضرات في التاريخ الدولة الاموية، تحقيق: السيخ محمد العثماني، بيروت، ٢٠٠٠: ٣٥٧.



زمانیش دەبێتە هۆی لەناو بردنی نەتەوەکە، چونکە لە شەڕی گەلانی بندەستدا، زمان دوا سەنگەری بەرگریکردنە لە چارەنووسی میللەتانی ژێر دەست[1]. بۆیە ئێستا ئەو هەموو وڵاتانەی کە لە شام و باکووری ئەفریقیادا بەدی دەکرێن، هەموویان بە نەتەوە و خاك و زمانەوە بە وڵاتانی عەرەبی دادەنرێن. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ بەرەو ڕوومان دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە بۆچی و چۆن زمانی کوردی توانی بەرگری بکاو نەتوێتەوە؟!! چۆن توانی بەرامبەر ئەو شاڵاوەی تەعریبکردنە خۆی ڕاگرێ؟ لە کاتێکدا کەڵبەی ئەو شاڵاوە گەیشتە ئەو پەڕی ڕۆژئاواو وڵاتانی وەك مەراکیش (مەغریبی ئێستا) و مۆریتانیای داگیر کرد، تەعریبکردن چۆن بوو نەی توانی زمانی کوردی لە کوردستاندا بسڕێتەوە؟ لە کاتێکدا لە ڕووی جواگرافییەوە ئەگەر وڵاتی کوردان لەگەڵ مەراکیش بەراورد بکەین، لە ڕووی دووریانەوە لە سەنگەری تەعریبکردن و دەسەڵاتی عروبە ئەوا کوردستان لە باوەشی ئەواندایە و، لەم دەسەڵاتە زۆر نزیکترە، کەچی کاریگەری لەسەر نەبووە یان زۆر کەمتر بووە. بۆچی زمانی کوردی توانی خۆی ڕابگرێ؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارەش دەتوانیین چەند هۆکارێك دەست نیشان بکەین. بەباوەڕی من چەند هۆکارێك هەیە، بەڵام گرنگترین هۆکار ئەوەیە زمانی کوردی و عەرەبی لە ڕەگەزدا سەر بە دوو خێزانی زمانی جیاوازن و بەو ئاسانییەش زمانی کەمینە لەناو زمانی دەسەڵاتدار ناتوێتەوە؟!. بۆیە زمانی کوردی تاکە هۆکارێك بووە، کە نەتەوەی کوردی پاراستووە و کوردستان ئەمڕۆ بە کوردستانیەتی هێشتۆتەوە.

## تەعریبکردنی زمان

جگە لەو کۆمەڵە نەتەوەی کە توانەوەو بوون بە عەرەب. نەتەوە مسوڵمانەکانی تر کە بەڕەگەز هاو خێزانی زمانی عەرەبی نەبوون کاریگەرییەکی زۆری زمانی عەرەبی لەسەر زمانەکانیان بەدی دەکرێ. بۆ نموونە فارسی و تورکی و کوردی.

[1]- د. عەبدوڵڵا پەشێو، سەرچاوەی پێشوو.

تەنانەت وشەی زمانی عەرەبی بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لەنێو ئەو زمانانەدا بەکار دەهات، بە رادەیەك کە فارسەکان لەسەر بەنزین خانەکان زۆر بەئاسایی دەنووسن (استعمال دخانیات اکیدا ممنوع است). زمان کوردیش لەم کاریگەرییە بەدەر نەبوو. تەنانەت ئەگەر سەیری زمانی ڕاگەیاندنی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بکەین، دەبینین بەهەمان دەرد گرفتارە. هەر بۆ نموونە ئەمە دەقێکی ڕۆژنامەی (بانگی حەق) کە لە ساڵی **١٩٢٣** نوسراوە.

**((امرو روز غیرته ، روز مروته، اوردوی کوردستان به قوماندار و هیئت ضابطان و افرادیوه التحاقی منیان کرد، طرف طرف مجاهدینی شار و قوای ملیتي اکراد، له احضاراتیکی متوالیدا خریك و مشغولن، ئیمه هتا روحمان له بدنمانا مابی بو استخلاص و اعتلای اسلام و ملت کورد به عزم و ایمانیکی تواو صرف اجتهاد و مقدرت اکةین بشتمان بة خوا و روحانیتی حضرت فخر کائنات قائمة))**[1].

کە سەرنج دەدەینە ئەم زمانە، ئەو ڕێژە زۆرەی وشەی عەرەبی تێدایە، ڕەنگە خوێنەواری کورد ئەمڕۆ بە ئاسانی لە زمانەکەی نەگا. لێرەدا باس لە گەشەکردنی ڕێنوسی کوردی ناکەم. ئەوەی بەلای ئەو لێکۆڵینەوەیە گرنگە زمانەکەیە. کە ئێستا کورد چۆن توانی زمانەکە وا پاراو بکات و وشە عەرەبییەکان بە وشەی کوردی بگۆڕێ.

## هەوڵی پاراوکردنی زمانی کوردی

لەسەرەتای سەدەی بیستەم بیری ناسیۆنالیزمی لە نێو نەتەوەکانی رۆژهەڵاتدا بڵاوبۆتەوە. بەتایبەتی لای کوردو عەرەب.....هتد. تورك و فارس هەوڵی ئەوەیاندا کە زمانەکەیان لە وشەی عەرەبی بژار بکەن. تەنانەت فارسەکان دەزگای تایبەتیان بۆ ئەم کارە دانا. ئەگەرچی نەیانتوانی وەکو کورد لەم هەوڵەدا سەرکەوتووبن.

[1] - رۆژنامەی بانگە حەق، ژمارە ١، **١٩٢٣**.



لێرەدا هاوکێشەیەکی سەیر دێتە بەرچاو. فارس خاوەنی دەسەڵات و سەربەخۆیی و پارەیەکی زۆرو چاپخانەیەکی فراوان و وەزارەتی پەروەردەو...هتد بوو هەوڵی دا بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. کە دەزگای تایبەتیشی بۆ ئەم کارە دروست کرد تەنانەت وەك بیری سیاسی بزووتنەوەی پان ئیرانیزم کاریگەری و پاڵپشتییەکی بەهێزی میلی بۆ ئەم بیرە دروستکرد. کەچی سەرنەکەوت تا ئێستاش بە رێژەیەکی یەکجار زۆر وشەی عەرەبی تێدا بەکاردێ. بەڵام گەلی کورد لەنێو شەڕوشۆڕ و بۆردومانی فرۆکەو نەبوونی دەزگایەکی کوردی و دابەشبوونی بۆ چەند پارچەیەك ئەم هەوڵەیداو سەرکەوتنیشی بەدەست هێنا. چۆن؟

## هۆی سەرکەوتنی هەوڵەکە

سەرکەوتنی هەوڵەکە چەند هۆکارێکی لەپشت بوو، لەوانە:

١- بەبۆچوونی من زمانی کوردی تاکە هۆکارێك بووە بۆ پاراستنی نەتەوەی کورد. وەك نەتەوەیەکی تر بۆی نەشیاوە کە پشت بە بنەماکانی تر ببەستێ کە خۆی وەك نەتەوەیەك پێی جێگیر بکات. لەبەر ئەوە بوونی ترس. ترسی توانەوە و لە ناوچوون، وەك هەستێك لەلای کورد هەبووە. ئیتر ئەم ترسە بۆتە هەوێنی سەرکەوتنی ئەم هەوڵە هیچ چارەیەکی تری نەبووە بۆ خۆپاراستن جگە لە سەرکەوتن. ئەم هەستەش یان ئەو هۆشیاریە وەك ڕۆژگاری ئەمڕۆ بەهۆی رۆژنامەو کەناڵی سەتەلایت لەلای خەڵك دروست نەکرا، بەڵکو هەستێکی سروشتی خۆکرد بوو لەلای کورد. بۆیە بەناچاری هەموو توانای خۆی لەزمانەکەدا بەکارهێناو بەشێوەی کارەکی کردی بە رەمزی نەتەوەیی خۆی. یان بە واتایەکی تر زمان تاکە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی بوونی خۆی بسەلمێنێ وەك نەتەوە. زمانی کوردی توانی ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە نەبوونی دەسەڵات و کیانی سیاسی دروستیان کردبوو. هەر بۆیەش توانای خۆی لە زماندا بەگەڕخست و لە هەوڵەکەیدا سەرکەوت، بەڵام فارس یان تورك

هۆكاری تری وەك ئابووری و كیان و...هتد یان هەبوو بۆ ئەوەی خۆی پێ بسەلمێنێ.

٢- هۆكاری دووەم بۆ سەركەوتنی ئەم هەوڵە ئەوە بوو، كە كورد لەم قۆناغەدا، واتە قۆناغی دەستكردن بە پاراوكردنی زمانەكەی، كەرەستەیەكی نوسراوی ئەوتۆی نەبوو یان زمانێكی ستاندەری چەسپاوی نەبوو كە نەتوانێ دەستبەرداری بێ و بەناچاری بەكاری بهێنێ. واتە لە كاتێكدا كورد دەستی بە نوسین كرد، كە هاوكات هۆشیاربوونەوەی نەتەوەیی گەشەی دەكرد، هێشتاش ستاندەرێك نەچەسپا بوو، بۆیە زمان نەكەوتبووە سەر سكەیەكی تایبەتی و قالبێكی چەسپاوی وەرنەگرتبوو بۆیە، ئاراستەكردنی زمان بەلای مەبەست ئاسانتر بوو. كەچی لای فارس یان تورك كە ماوەیەك بوو زمانەكەیان چەسپابوو، ئاراستەیەكی دیاریكراوی وەرگرتبوو، گۆڕینی ئاراستەكەش ئاسان نەبوو، یان گۆڕینی ئەو قالبە ئاسان نەبوو، كە سەدان ساڵ بوو چەسپا بوو.

٣- لە نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەم هاوكات لەگەڵ بزوتنەوەی رزگاریخوازی، بزوتنەوەیەكی هۆشیاری و رۆشەنبیریش لە كوردستاندا دەستی پێكردبوو. رۆشەنبیرانی كورد رابەرایەتی هەردوو بزوتنەوەكەیان دەكرد. رۆشەنبیرانی ئەو كات رابەرایەتی سیاسیان دەكرد. واتە هەردوو بڕیار یان وردتر بڵێین هەردوو ئەركی سیاسی رۆشەنبیری لە دەست ئەواندا بوو. دەیانتوانی بەو ئاراستەیەدا بیبەن كە دەیانوسین، لەو كاتەدا سیاسەت دانەبڕابوو نەببوو بە پیشەی تایبەت و بڕیاربەدەست، تا بە ئاراستەی جیاوازجیاوازدا بیبات.

هەستكردن بەو بەرپرسیاریەتیە مێژووییە نەتەوەییە و بەرنامەدانان بۆ سەركەوتنی هەوڵەكە و جێبەجێكردنی لە ئەستۆی نووسەر و رۆشەنبیراندا بوو. ئیتر ئەوانیش هەوڵەكەیان بە پیرۆزی گەیاند، بەڵام لە رۆژگاری ئەمڕۆدا تەنیا هەستكردن و خستنەڕووی كێشەكان لەدەست رۆشەنبیردایە بەرنامەدانان و جێبەجێكردنی كەوتۆتە دەست سیاسەت.





بەكارهێنانی دوو ستاندەر سەرەنجام دوو نەتەوەی لێدەكەوێتەوە، كە دابەشبوونی بیرو هەست دروست دەكا دوای ماوەیەكی زۆر دەبێتە هۆی دروستبوونی دوو شارستانیەت. ئەمانەش هەمووی هۆكارن بۆ دابەشبوونی نەتەوە. ئەو نەتەوانەی كە ئەمڕۆ بە رەگەز لە یەكتری نزیكن و شارستانییەتی جیاوازیان هەیە، سەرەتا دوو زاری یەك زمان بوون، دوای لە یەكتری جیابوونەتەوە و بوون بە دوو زمانی سەربەخۆ، نەتەوەكانیش لەگەڵ زمانەكان لە یەكتری جیابوونەتەوە. بۆ نموونە زمانی كوردی و زمانی فارسی یان زارەكانی رۆمانی كە ئەمڕۆ زمانەكانی ئیتالی و فەرەنسا و ئیسپانی و پورتوگالی لێكەتۆتەوە[1]. ئێستا هەریەكەیان بووە بە زمانێكی سەربەخۆ و نەتەوەیەكی سەربەخۆ و تەنانەت شارستانییەتی سەربەخۆشیان هەیە. زۆر لە بیرمەندەكان هەوڵیانداوە كە پەیوەندی یاسا رێزمانییەكانی زمانێكی دیاریكراو بە چۆنیەتی بیركردنەوەی كۆمەڵگاكە بدۆزنەوە. هەروەها پەیوەندی دەستووره رێزمانیەكان لەلایەك و لە لایەكی تریشەوە چۆنیەتی بیركردنەوە و فەلسەفەی بەرهەم و تێروانیینی ئەو كۆمەڵگایە بۆ ژیان دەربخەن. بۆ نموونە هەوڵیانداوە فەلسەفەی ئەڵمانی لەسەر بنچینەی ئەو سروشتە تایبەتییەی كە دەستووری زمانی ئەڵمانی هەیەتی شیبكەنەوە. كە گوتویانە ئەگەر لە زماندا ناو پێش ئاوەڵناو بێ، ئەوا كۆمەڵگاكە لەوە رادێن كە بە رێگای Diductive (استنتاجی) بیر بكەنەوە. ئەو زمانانەی كە تێیاندا ئاوەڵناو لە پێش ناوەوە دێن، وەك زمانی ئینگلیزی ئەوا كۆمەڵگاكە و ئەوانەی بەو زمانانە قسەدەكەن بە رێگای (Indactive) (استقرائیه) بیر دەكەنەوە[2]. ساپیر یەكێكە لە زمانەوانە ناودارەكانی سەدەی بیستەم بە توندی پشتی ئەو بۆچوونە دەگرێت، پێی وایە زمان وا دەكات كە كۆمەڵگا بە رێگایەكی دیاریكراو

[1]- فوئاد حەمە خورشید، زمانی كوردی دابەشبوونی جوگرافیای دیالێكتەكان، ١٩٨٥: ١٩.
[2]- د. نایف خرما، اضواء علی دراسات اللغویة المعاصرة، عالم المعرفة سلسلة ٩، طبعة الثانیة، ١٩٧٩، ص: ٢٢٠.

بیر بکاتەوە و هەڵسوکەوت بکات. واتە بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی هەمان ڕێگایە کە زمانەکەی هەیەتی. کۆمەڵگا ناتوانی کە جیهان ببینیّ تەنیا لە چوارچێوەی زمانەکەیدا نەبیّ. تەنانەت زۆر بە ڕاشکاوی دەڵیّ (مرۆڤ تەنیا لە جیهانی مادیدا ناژی، هەروەها بەتەنیاش لە جیهانی چالاکییە کۆمەڵایەتیەکاندا ناژی، لە ڕاستیدا کەوتونەتە ژێر بەزەیی زمانەکەیان، ئەو زمانەی کە بەکاری دەهێنن و لە نێو خۆیاندا پەیوەندی پێدەکەن. لە ڕاستیدا جیهانی حەقیقەت بە ڕێژەیەکی زۆر لەسەر بنەمای زمانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو دروست کراوە. هەروەك چۆن لە جیهاندا دوو زمانی هاوشێوەی تەواو نییە، کە بەشێوەیەك نوێنەری هەمان واقیعی کۆمەڵایەتی بێت[1].

**بایەخدان بە زمانی کوردی**

ڕۆژگاری ئەمڕۆ بە سەردەمی زانیاری ناو دەبریّ، دەسکەوتنی زانیاری بەهۆی ئەنتەرنێت و هۆکارەکانی تری گەیاندن بەرادەیەك ئاسان بووە، کە لە ماڵەکەی خۆتدا دەتوانی زانیاری لە هەموو بوارێکدا دابین بکەی، سادەترین یان ئالۆزترین بابەت لە ئەنتەرنێتدا بەدوایدا بگەڕێی بە هەزارەها لاپەرە و لێکۆڵینەوەت دێتە بەردەستت، بەڵام لە بارەی هەر بابەت یان ئاستێکی تری زمانی کوردی ناتوانی بابەتێکیش بدۆزیتەوە، ئەمەش هەژاری لێکۆڵینەوەی زمانەوانی دەسەلمێنیّ لە بواری زمانی کوریدا. هەمووشمان دان بەم هەژارییەدا دەنێین تەنانەت قوتابیانی زانکۆ و قۆناغی ماجستێر و دکتۆرا نەبوونی سەرچاوە و لێکۆڵینەوە بۆتە گرفتێکی هەمیشەییان، لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدا، ئەویش ئەوەیە بۆچی کتێبخانە یان ئەنتەرنێت لە بواری لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیدا هەژارە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە لە هەموو بوارەکانی زانست و زانیاری بە هەزارەها کەس کاردەکەن، هەر بوارێکی ئەبستمۆلۆژی وەربگری بە بەردەوامی

[1] د. نایف خرما، المصدر نفسه، ص٢٢١.



سەدان و هەزاران دەزگا لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن، هەر بۆ نموونە، لەم جیهانەدا چەند کەس خەریکی لێکۆڵینەوەیە لە زمانی ئینگلیزی، نەخۆشییەکان، ئەتۆم، وەرزش... هتد، بێگومان ژمارەیەکی یەکجار زۆرن، بەڵام چەند ئەکادیمیست لە جیهاندا لە زمانی کوردی دەکۆڵێتەوە؟ ڕەنگە ئەگەر بڵێین چل کەسن، ئەوا زیادەڕۆییمان کردبیّ.

لەبەر ئەوەی بابەتەکەی ئێمە لەسەر زمانە با بە نموونە زمانی ئینگلیزی یان عەرەبی لەگەڵ زمانی کوردیدا بەراوردبکەین، لە هەریەك لەم زمانانە هەزارەها سەرچاوە لەبەردەست دایە، هەر بوارێکی زمانەوانی یان ئاستێکی زمان وەربگرین بە سەدان و هەزاران لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە بەڵام لە زمانی کوردیدا، بەزەحمەت سەرچاوەیەکی ئەکادیمیت دەستدەکەویّ، هۆکاری ئەم هەژارییەش دەشیّ بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بگەڕێنینەوە.

یەکەم/ لای هەمووان ڕوونە زمانی عەرەبی یان ئینگلیزی سەدان ساڵە لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکری و تا ئێستاش بەردەوامە، تەنانەت ڕۆژ بە ڕۆژیش ژمارەی ئەو دەزگایانەی کە لەم زمانانە دەکۆڵنەوە زیاتر دەبیّ ئەمەش، وایکردووە کە ببن بە خاوەنی گەنجینەیەکی گەورەی زمانەوانی، بەڵام لەلای کورد ئەم هەوڵە زۆر درەنگ دەستی پێکرد، لە کۆندا ئەو کوردانەی کە خوێندەوار بوون مەلاکان بوون، ئەوانیش ڕۆژێك گوێی شەیتانیان کەڕنەکردووە ئاوڕێك لە زمانی کوردی بدەنەوە، بەرهەم و شەونخونی و ماندووبونیان هەمووی بۆ صرف و نەحو و بەلاغەی عەرەبی بووە، تەنیا دوو کەسیان نەبێت، کە ئەوانیش (خانی) و (شێخ مارفی نۆدەیی) بوون، دوو فەرهەنگیان داناوە، مەبەست لەم فەرهەنگانەش دیسانەوە شارەزابوون بووە لە زمانی عەرەبی واتا لە پێناو زمانی عەرەبی نوسراون، نەك کوردی، تا سەدەی بیستەم، و لە کۆتایی دەیەی دووەمدا یان ڕاستر بڵێین لە ساڵی ١٩٢٨ یەکەم کتێب لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بە کوردی نوسراوە، ئەویش لەلایەن مامۆستا سەعید سدقی کابان[1]، لە دوای ئەویش

[1]- سەعید سدقی کابان، مختصر صرف و نحوی کوردی، بەغدا، ١٩٢٧.

مامۆستا تۆفیق وەهبی کتێبێك بە ناونیشانی دەستوری زمانی کوردی[1] چاپ دەکات، ئیتر بەرەبەرە لە ساڵێکدا یان چەند ساڵێکدا کتێبێك چاپکراوە. تەنانەت ئەو کتێبانەی کە چاپ کراون، زۆریان لە بارەی ڕێنوسی کوردیەوەیە، هەر بۆ نموونە لیستی ئەو کتێبانە دەخەمە روو کە لە بارەی زمانی کوردیەوە نوسراون[2].

| ساڵ | ناوی نووسەر | ناوی کتێب | شوێنی چاپ |
|---|---|---|---|
| ١٩٢٠ | محەمەد ئەمین زەکی و میرزا محەمەد باشقە | قرائەتی کوردی | بەغدا |
| ١٩٢٨ | سەعید سدقی کابان | مختصر صرف و نحوی کوردی | بەغدا |
| ١٩٢٩ | تۆفیق وەهبی | دەستوری زمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٢٩ | ئەحمەد عەزیز ئاغا | ئەلفبای کوردی | بەغدا |
| ١٩٣٠ | مەعروف جیاوك | بەرگی ئیملای کوردی | بەغدا |
| ١٩٣٢ | جەلادەت عالی بەدرخان | روپەلنەن ئەلفابێ | شام |
| ١٩٣٣ | تۆفیق وەهبی | خوێندەواری باو | بەغدا |
| ١٩٣٦ | حامید فەرەج | ئەلفوبێی کوردی | بەغدا |
| ١٩٣٨ | کامەران عالی بەدرخان | ئەلفابێ یا کوردی | شام |
| ١٩٣٨ | کامەران عالی بەدرخان | ئەلفابێ یا من | شام |
| ١٩٤٥ | ئەکرەم جەمیل پاشا بورج | ئەلفابێ یا کوردی | شام |

[1] - تۆفیق وەهبی، دستور زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٢٩.
[2] - بۆ ئەم خشتەیە سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە: د. ئەورەحمان حاجی مارف، رابەری سەرچاوە لە بارەی زمانی کوردیەوە. بەغدا، ١٩٨٩.



| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٤٨ | ڤ. ف. مینۆرسکی | زمانێ کورمانجی | یەریڤان |
| ١٩٤٩ | د. قەناتی کوردۆ | زمانی کوردی | یەریڤان |
| ١٩٥٠ | ئەمینێ عەڤدال | میتۆدیکا زمانێ کورمانجی | یەریڤان |
| ١٩٥١ | حاجی جندی | ئەلفبا | یەریڤان |
| ١٩٥٦ | عوبەیدیللا ئەیوبیان | بەرڕەسی و تەحقیقی زمان و ئەدەبیاتی کوردی | تەورێز |
| ١٩٥٦ | نوری عەلی ئەمین | قەواعیدی زمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٥٧ | ئەمینێ عەڤدال و ش. ئەمین | کتێبا زمانێ کوردی | یەریڤان |
| ١٩٥٧ | د. جەمال نەبەز | خوێندەواری بە زمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٥٧ | د. جەمال نەبەز | نووسینی کوردی بە لاتینی | بەغدا |
| ١٩٥٧ | حاجی جندی و ن. جەواری | ئەلفبا | یەریڤان |
| ١٩٥٨ | ئەمینێ عەڤدال | خەبەرناما کوردیا راستنڤیساندنە | یەریڤان |
| ١٩٥٨ | سالار- مستەفا قەرەداغی | زبان چۆن پەیدا بووە | سلێمانی |
| ١٩٥٨ | د.مەکەنزی | نووسینێکی تازە بۆ زمانی کوردی | |
| ١٩٥٨ | نوری عەلی ئەمین | گرتنی کەلێنێکی تر لە رێزمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٥٩ | حاجی عەبدولرەحیم وەفی | چۆن فێری زمانی کوردی ئەبی بەبێ مامۆستا | سلێمانی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٦٠ | گیو موکریانی | ئەلفوبێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی | هەولێر |
| ١٩٦٠ | نوری عەلی ئەمین | ڕێزمانی کوردی | سلێمانی |
| ١٩٦٠ | ص. هەژار | سۆرانی یان کرمانجی | سلێمانی |
| ١٩٦١ | جگەر خوێن | اوا و دەستورا زمانێ کوردی | بەغدا |
| ١٩٦١ | د.شاکر خصباك، وەرگێڕانی ئەمین موتابچی | کوردو مەسەلەی کورد | سلێمانی |
| ١٩٦١ | عومەر عەبدولڕەحیم | ڕابەری مامۆستا | سلێمانی |
| ١٩٦٥ | کامەران عالی بەدرخان | زمانی مادەر | پاریس |
| ١٩٦٦ | نوری عەلی ئەمین | ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی | بەغدا |
| ١٩٦٨ | حەمەکەریم ڕەمەزان هەورامی | سایکلۆجیەتی خوێندنەوە | سلێمانی |
| ١٩٦٩ | مێژووی نەژاد و پەیوەستەگی کورد | ڕەشید یاسمی | سلێمانی |
| ١٩٦٩ | تاهیر سادق | ڕێنوس – چۆنیەتی نوسینی کوردی | کەرکوك |
| ١٩٦٩ | گیو موکریانی | فێربوونی زمانی کوردی بەبێ مامۆستا | هەولێر |
| ١٩٧٠ | حەمەکەریم ڕەمەزان هەورامی | بنچینەکانی وتنەوەی زمانی کوردی | هەولێر |
| ١٩٧١ | عوسمان عارف | چۆن فێری زمانی کوردی ئەبی | کەرکوك |



| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٧١ | د.عزەدین مستەفا رەسول | سەرنجێ لە زمانی ئەدەبێ یەکگرتووی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٢ | گیو موکریانی | ئەلفوبێی وێنەدار بە تیپی لاتینی | هەولێر |
| ١٩٧٣ | د.ئەورەحمان حاجی مارف | چی لە بارەی زمانی کوردی نەسراوە | بەغدا |
| ١٩٧٣ | سادق بەهائەدین | ئیدیەمێت کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٣ | محەمەد ئەمین هەورامی | سەرەتایەك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٣ | د.نەسرین فەخری | چاوگی بێ واتا لە زمانی کوردیدا | نەجەف |
| ١٩٧٣ | د.قەناتی کوردۆ | هەندێك بیروڕای هەڵە لە بارەی زمان ومێژوو کوردەوە | بەغدا |
| ١٩٧٤ | محەمەد ئەمین هەورامی | فۆنەتیکی زمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٤ | مەسعود محەمەد | ورد بوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٥ | د.ئەورەحمان حاجی مارف | وشەی زمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٦ | ئەحمەد حەسەن ئەحمەد | ڕێزمانی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٦ | د.ئەورەحمان حاجی مارف | زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا | بەغدا |
| ١٩٧٦ | د.جەمال نەبەز | زمانی یەکگرتووی کوردی | بامبێرگ |
| ١٩٧٦ | حامید فەرەج | ڕێنوسی کوردی لە سەدەیەکدا | بەغدا |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٧٦ | سادق بەهائەدین | ڕێزمانا کرمانجی | بەغدا |
| ١٩٧٦ | عەبدوللا شالی | ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و فرمان | بەغدا |
| ١٩٧٦ | کۆڕی زانیاری کورد | ڕێنوسی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٦ | لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری | ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٦ | مەسعود محەمەد | چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی | ب |
| ١٩٧٧ | د.ئەورەحمان حاجی مارف | وشە رۆنان لە زمانی کوردیدا | بەغدا |
| ١٩٧٧ | کەریم زەند | زمانی کوردی و هونەری وەرگێران | سلێمانی |
| ١٩٧٨ | سابیر گردعازەبانی | چۆن فێری زمانی عەرەبی دەبیّ | سلێمانی |
| ١٩٧٨ | د. کەمال مەزهەر | تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامە نوسی کوردیدا | بەغدا |
| ١٩٧٨ | مەسعود محەمەد | بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی | بەغدا |
| ١٩٧٩ | د.ئەورەحمان حاجی مارف | ڕێزمانی کوردی (بەرگی یەکەم) | بەغدا |
| ١٩٧٩ | م. بەرزنجی | فێربوونی زمانی کوردی بەبێ مامۆستا | بەیروت |
| ١٩٧٩ | د. کامل جەسەن بەسیر | زاراوەی کوردی | سلێمانی |



بە بۆچوونی من لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی لە بواری زمانی کوردی سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ کردنەوەی بەشی زمانی کوردی بە تایبەت کردنەوەی خوێندنی باڵا لە بەشی زمانی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین. ئەم بەشە وەك دەزگایەکی زانستی لە زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە هەرچەندە ڕێژەیەکیش لە قوتابیانی کورد لە دەرەوە بە تایبەتیش لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو لە زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە بەڵام لێکۆڵینەوەکانیان بە زمانی کوردی نەبووە و کورد کەمتر سوودی لێ بینیوە، جگە لەمەش کۆڕی زانیاری کوردی ڕۆڵی هەبووە لەم بوارەدا واتە سەرەتای لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی لە زمانی کوردیدا بۆ حەفتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە.

دووەم/ هۆکاری دووەمی ئەم هەژارییە بۆ کەمی ژمارەی لێکۆڵەر و کەمی ژمارەی ئەو دەزگایانە دەگەڕێتەوە کە لە زمانی کوردی دەکۆڵنەوە. بۆ نموونە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە زمانی ئینگلیزی یان عەرەبی دەکۆڵنەوە لە دەیان هەزار کەس تێپەر دەکات، تەنانەت هەزاران بەشی زانستی لە زانکۆکانی سەرتاسەری جیهان و دەیان کۆڕی زانیاری و بنکە و ڕێکخراو و یانە... هتد، سەرقاڵن بە لێکۆڵینەوە، بەڵام ئایا ئەوانەی کە توانای لێکۆڵینەوەیان هەیە لە زمانی کوردی ژمارەیان چەندە، ڕەنگە ئەگەر بڵێم (چل تا پەنجا) کەسە ئەوا زیادەڕۆیی تێدابێ، ڕێژەیەکیش لەمانە بەکاری لاوەکیەوە خەریك کراون[1].

---

[1] جگە لەمانەش ئەم چەند کەسە تەواو فەرامۆش کراون لەلایەن دەسەڵاتەوە و راوێژیان پێ ناکرێ، تەنانەت کە پڕۆژەش دەخەنە روو جێبەجێ ناکرێ، زۆر جار لەسەر هەندێ بابەت کۆڕ و کۆبوونەوەیان کردووە و، پێشنیاریان خستۆتە روو و بەڵام تەنیا وەك مەرەکەبی سەر کاغەز ماوەتەوە، دەسەڵاتی کوردی بیری لەوە نەکردۆتەوە کە ئەو کەسە ئەکادیمیەی بواری زمانی کوردی گەنجینەیەکی بەنرخی ئەم نەتەوەیەن و هەوڵ بدا تواناکانیان بەگەر بخات و نەیەڵێ بەکاری ترەوە خەریك بن، چونکە لە سەرتاسەری جیهاندا هەر ئەوەندە هەیە، لە هەموو بوارەکانی تردا زانیاری، پیسپۆر بەئاسانی پەیدا دەکرێ، بۆ نموونە فیزیا، کیمیا، کشتوکاڵ، ئەندازە...هتد. گەر حکومەت پێویست بێ دەتوانێ پارە بدات و چاکترین کۆمپانیا بهێنێ بۆ=

سێیەم / هۆکارێکی تر ئەوەیە کە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی جگە لە عەرەبەکان و ئینگلیزەکان خۆیان، خەڵکانی تریش لە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی دەکۆڵنەوە، بەڵام ئەوانەی کە کورد نیین و لە کوردی دەکۆڵنەوە زۆر دەگمەنن (لە ساڵانی پەنجاکاندا مەکارەس و مەکەنزی، یوسیتی، لیرخ و... هتد، لە زمانی کوردیان کۆڵیوەتەوە، ئەمانەش ژمارەیان لە پەنجەکانی دەست تێپەرناکا، بۆیە دەبینین کورد لەم بوارەدا جگە لەخۆی کەسی تر یارمەتی نادات، تەنانەت لەم کوردستانەی ئێمەدا، ساڵانە چەندین نامەی ماجستێر و دکتۆرا لەسەر زمانی عەرەبی و ئینگلیزی دەنوسرێ، کە ئەمانەش لێکۆڵینەوی زانستین، واتە کورد کە خۆی خاوەن هیچ سەرچاوەیەك نیە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی هەزاران کەسیان هەیە، کوردیش ئەوەندەی بۆ زمانەکەی خۆی دەکا، ئەوەندەش ئەگەر زیاتر نەبێ بۆ زمانی عەرەبی و ئینگلیزی دەکا.

بۆ ئەمەش پێویستە زانکۆ پلانی تایبەتی هەبێت، هانی قوتابیانی خوێندنی باڵای بەشەکانی وەك عەرەبی و ئینگلیزی...هتد بدات، کاتێك کە لێکۆڵینەوە دەنوسن هەوڵدەن بۆ ئەوەی لێکۆلینەوەکانیا بە پێی تایبەتمەندنی بە بەشەکەیان لەگەڵ کوردیدا بەراورد بکەن.

---

=هەموو کارێك کە پێویست بێ، بەڵام ناتوانێ زانیاری و کادیری زمانی کوردی لە دەرەوە بکڕێ، لە بەرئەوەی ئێرە سەرچاوەکەیە گەر وڵاتانی تر یان زانکۆکانی بیانی پێویستیان بە زانیاری یان پسپۆر بوو لە بواری زمانی کوردی، ئەوا دەبێ لێرەوە بیبەن. چونکە ئێرە سەرچاوەکەیە، گەر میری پلانی هەبێ بۆ دەوڵەمەندکردنی سەرچاوە لەسەر زمانی کوردی، ئەوا دەبێ ئەم پسپۆرانەی زمانی کوردی وەك دراوی دەگمەن هەڵسەنگێنێت و نەیەڵێ کاتژمێرێکیان بە فیڕۆ بڕوا، دەزگاو شوێنی وایان بۆ دابین بکات، کە هەمیشە خەریکی لێکۆڵینەوە و دەرسگوتنەوە بن، تەنانەت زۆر لەوانە ئەو گیانەیان تێدانیە و خۆیان نرخی خۆیان نازانن پێویستە میری ئەو گیانەشیان لەلا دروست بکات، میری بیری لەوە نەکردۆتەوە کە بە مردنی هەر یەکێك لەمانە چ زانیاریەك لەناودەچێ، چەند پارە و چەند کاتی پێویستە تا پسپۆرێکی تر دروست دەکا.



یان میری ئەگەر لە ماوەی ئەم (١٥) ساڵە هەوڵی نەداوە، ئەوا لە داهاتوودا هەوڵ بدا لە زانکۆکانی دەرەوەی عێراق بە تایبەتیش ئەوروپا و ئەمەریکا بەشی زمانی کوردی بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر لەسەر خەرجی خۆشمان بێ بۆ ئەوەی خەڵکی بیانیش فێری کوردی بن و بەلایەنی کەمەوە گورو تینێك و چالاکییەك دروست بکات. فەرەنسیەکان کە بەم شێوەیە زمانیان بڵاوبۆتەوە کەچی هێشتا دێن بۆ کوردستان و هانمان دەدەن بۆ ئەوەی بەشی فەرەنسی لێرەدا بکەینەوە، بەهەمان شێوە ئیسپانیەکان پەیمانگا لە کوردستان دادەمەزرێنن بۆ فێربوون و بڵاوبوونەوەی زمانی ئیسپانی، فەرنساو ئیسپانیا و بەریتانیا بەم دەسەڵات و توانایەوە هەوڵی وا بدەن، ئێمە دەبێ چی بکەین؟؟ حکومەتی ئیسپانیا بۆ گەشەپێدانی زمانی ئیسپانی لە شوێنەکانی تر واتە لە دەرەوەی ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٩٠ بڕی ٧٥٠٠٠٠٠٠ حەفتا و پێنج ملیۆن دۆلاری بۆ پرۆژەی گەشەپێدانی زمان تەرخان کردبوو.

ئەم سێ خاڵەی سەرەوە هۆکاری هەژاری کتێبخانەی کوردین لە بواری زمانەوانییەوە، ئەرکی سەرشانی میری و دەزگا پەیوەندارەکانە کە کاری بۆ بکەن بە تایبەتی لەم چەرخی زانیارییەدا ئەگەر زۆر خێرا نەرۆین، ئەوا بەجێ دەمێنین.

## بەشی دووەم (زمانی یەکگرتوو)

### زمانی یەکگرتوو

لە رابردوودا کورد و رۆشنبیرانی کورد بیریان لەوە کردۆتەوە کە زمانی ستاندەر بۆ کورد دروست بکرێ و بەپێویستیەکی مێژوویان داناوە. ئەم هەوڵدانەش بۆ چوار قۆناغ دابەش دەکەم کە ئەمانەن:

**قۆناغی یەکەم/** سەرەتا ئەم بیرە لەلای چەند کەسێکەوە دەخرێتەڕوو و کاری پێ دەکەن و بۆ نووسین بەکاری دەهێنن، ئەمەش مێژوویێکی ئەوەندە کۆنی نییە و بۆ سەدەی حەڤدەم دەگەڕێتەوە، نووسەر و زاناو رۆشنبیری ئەو کاتیش لەناو کوردا شاعیرەکان بوون، دەبینین لەلای جزیری لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەهەم و سەرەتای سەدەی حەڤدەم ئەم هەوڵە دەست پێ دەکا دوای ئەوە تاماوەیەکی زۆر کپ دەبێ ، نالی و خانی کە شارەزاییەکی زۆر باشیان لە زمانی عەرەبی و فارسیشدا هەبووە، کەچی وەك رووبەڕووبونەوەیەك (تحدی) هەوڵیانداوە بە کوردی بنوسن، ئەوتا نالی (١٨٠٠- ١٨٥٦) دەڵێ:

**کەس بە ئەلفازم نەلێ خۆکردییە خۆ کوردییە**
**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا**

ئەمەیان شۆڕشێك بووە لەکاتی خۆیداو جورئەتێکی گەورەی ویستووە، تەنانەت ئەم زمانی نووسینەی ئەمڕۆ ئێمە بەکاری دەهێنین سەرچاوەکەی لەم بەرەنگاربونەوەی (نالی)یەوە دەست پێدەکات.
لەم قۆناغەدا نالی و خانی ئەوەندە دەسەڵاتیان نەبوو، کە زمانێکی یەکگرتوو بسەپێنن، دەسەڵاتیان تەنیا لە چوارچێوەی بەرهەمەکانی خۆیاندا بووە. ئەوان



وەك دەزگایەك نەیانتوانیوە کاربکەن تەنیا ئەو خەون و ئومێدەی هەیانبووە توانیویانە لەسەر شیعرەکانی خۆیان پیادەی بکەن. لەمەشدا درێغیان نەکردووە.

**قۆناغی دووەم/** لەم قۆناغەدا هەوڵدان و کارکردن لەدەست تاکەکەسەوە دەکەوێتە دەست گروپ و دەزگا رۆشنبیرییەکان، ئەمەش لە سەدەی بیستەمدا زیاتر بەدی دەکرێ، هەر بۆ نموونە لە کۆنگرەی کوردناسی لە یەکێتی سۆڤیەت کە لە ساڵی **١٩٣٤** بەسترا[1] گفتوگۆ لەسەر ئەم بابەتە کراوە بڕیار درا زاری کرمانجی ژووروو بکرێتە زمانی ستاندەر. لە ساڵی **١٩٥٩**شدا لە کۆنگرەی یەکێتی مامۆستایانی کورد کە لە شەقڵاوە بەسترا گفتوگۆ لەم بارەیەوە کراو وەك کۆنگرە بڕیاریاندا کە زاری کرمانجی ناوەراست بکرێ بە زمانی ستاندەر[2].

ئەم قۆناغە ئەگەرچی بیری دروستکردنی زمانی یەکگرتوو ئاسۆیەکی فراوانتری وەرگرت لە کایەی تاکەکەسییەوە هەنگاوی نا بۆ کایەی گروپ و دەزگاکان، بەڵام دیسانەوە ئەم گروپ و دەزگایانەش رووبەڕووی هەمان گرفت بوونەوە، ئەویش نەبوونی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی بڕیارەکانیان بوو. هەر بۆیەش بڕیارەکانیان تەنیا وەك مەرەکەبی سەر کاغەز مایەوە، هەرچەندە کۆنگرەی یەکێتی مۆستایان توانیان لە کوردستانی باشووردا کار بەم بڕیارە بکەن، لە قوتابخانە و کتێبە مەنهەجییەکان بەکاری بهێنن و زاری کرمانجی ناوەراست گەشەیەکی زۆر چاکی کرد. بەڵام دیسانەوە بەهۆی بارودۆخی سیاسی هەمەچەشنەی کوردستان نەیتوانی بە تەواوی لە بەشەکانی تری کوردستاندا جێگیر بێ.

**قۆناغی سێیەم /** ئەم قۆناغە لەسەر ئاستی حکومەت یان دەسەڵاتی کوردییەوە، بوو دەشێ بڵێین لە دوای بەیانی ١١ ئازار دەست پێ دەکات، تا دوای راپەڕین درێژەی هەبوو، واتە لە ساڵی ١٩٧٠ تاکو چەند ساڵێك دوای راپەڕین.

[1]- د. جەمال نەبەز، زمانی یەکگرتوی کوردی، بامبێرگ، ١٩٧٦، ٨.
[2]- هەمان سەرچاوە، ٨.

بەگوڕوتینێك هاتۆتە گۆڕەپانەكەوە هەوڵدراوە بۆ خوێندن و نووسین بەكوردی، پارەی زۆریش لەم بوارەدا خەرج كراوە، لەم قۆناغەشدا كوردی ناوەراست تا رادەیەكی باش لە كوردستانی عێراق چەسپا.

**قۆناغی چوارەم/** لە قۆناغی یەكەم و بە تایبەتیش لە قۆناغی دووەمدا ئەو ئەركە مێژووییە لە ئەستۆی رۆشنبیران بووە جێبەجیان كردووە. لە قۆناغی سێیەمیشدا كۆمەڵێ كتێب و رۆژنامە و گۆڤار بە زمانی كوردی دەرچوون لە قوتابخانەكاندا بە كوردی دەخوێندرا، دەزگا رۆشەنبیرییەكان وەك كۆڕی زانیاری و یەكێتی نووسەران و ...هتد رۆڵی بەرچاویان هەبوو، تەنانەت لە سەرەتای راپەڕینیشدا ئەم قۆناغە گروتینێكی تری وەرگرت، بەڵام لەداوی راپەڕین لە (١٩٩٥) بە دواوە بڕیارەكان ئامانجێكی سیاسین یان راستر بڵێین حزبیان هەبووە نەك نەتەوەیی بۆیە دەبینین كار بۆ زمانی یەكگرتوو نەكراوە، تەنانەت ئەو زەمینەیەی كە پێشتر هیوای بۆ دەخوازرا و خەونی پێوە دەبینرا لەم قۆناغەدا هاتە ئاراوە. دەسەڵات لە دەست كورد خۆی بوو، كە چی بیری ناوچەگەرییەتی و حزبایەتی وایكرد كە لە جیاتی ئەوەی پڕۆژەی زمانی ستاندەر بە پیرۆزی بگا. دوو زمانی ستاندەر دروست كرا.

حكومەتی هەرێمی كوردستان (ئیدارەی هەولێر) لە قوتابخانەكاندا بایەخی بە شێوە زاری بادینی دەدا و تەنانەت وەك بەربەرەكانیەك ئیداری سلێمانیش هەوڵی دەدا كە زاری هەورامی ببوژێنێتەوە، ئیتر هەر لە راگەیاندن و رۆژنامە و گۆڤارەكانەوە بیگرە تا دەگاتە زمانی خوێندنی قوتابخانەكان و بەهەردوو زار بایەخی پێ دەدرا. لەم قۆناغەدا وەزارەتی پەروەردەی حكومەتی هەرێمی كوردستان (ئیدارەی هەولێر) لە روانگەی سیاسییەوە بۆ رازیكردنی هەردوو دیالێكتی سەرەكیی كوردی پشتی بە چەند كۆڵكە زمانەوانێك بەست بۆ دانانی مەنهەجی قوتابخانەكان بە شێوەیەك كە سەرنجی هەردوو لا رابكێشێت و هەردوو زارە سەرەكییەكە مافی خۆی وەربگرێ، رەنگە ئەوەشیان بە جۆرێك لە مافی



دیالێكت و دیموكراتی لێكدابیتەوە، كە هەوڵیاندەدا هەردوو لەهجە لە قوتابخانەكاندا بخوێنرێ، وەك ئەوەی بیانەوێ بڵێن حكوومەت یاخود حیزب بە چاوێكی یەكسان سەیری هەردوو دیالێكت دەكا، كۆلكە زمانەوانەكانیش رووبەرووی ئەم بۆ چوونە نەبوونەوە و پێی بڵێن: قوربان ئەمە لە سیاسەتدا ئاساییە، بەڵام لە زمانی خوێندن ناشێ، بەڵكو بە پێچەوانەوە بەرنامەیان بۆ دارشتن و، زیاتر هانیان دەدان ئێستاش لە نێو گێژاوێكدان هەرخۆیان دەزانن چۆنە، تەنانەت زۆربەمان خۆزگە بۆ كتێبەكەی (دارا دوو داری دی) ئەمین باڵدار دەخوازیینەوە كە لە پەنجاكانی سەدەی رابردوودا چاپكراوە. لە ساڵی ٢٠٠٧ كتێبێكی مەنهەجی ساڵی پەنجاكان بە پەسەندتر بزانرێ لە مەنهەجی ئێستا دەبێ نیشانەی چی بێ؟

سیاسەت لە جیاتی ئەوەی رۆڵێكی ئیجابی ببینێ ئەو هەنگاوانەی كە لە رابردوو هەڵێنراون، ئەمڕۆ ئەو جێگیری بكا، كەچی خەریكە ئەو دیوارەی كە ئەوان دروستیان كردووە دەیروخێنێ.

سیاسەتی ناسیۆنالیستەكان لە ئەزمونی زۆربەی گەلانی جیهاندا رۆڵی بەرەو پێشبردنی بە ئاراستەی نەتەوەیی دەبینێ، كەچی لای ئێمە لەبری كاركردن لەسەر شێوازی نەتەوایەتی كاری لەسەر سۆزی حزبایەتی كردووە. سسیاسییەكان بیریان لەوە نەكردۆتەوە كە ئەگەر سەندیكا و رێكخراو تەنانەت دادگای تەمیزیش دابەش بكەن، بیكەن بە دوو، وەك كردیان، ئەوا هەركاتێك بیانەوێ بەیەك بڕیار، یەك تاكە بڕیار زۆر بە ئاسانی یەكتر دەگرنەوە، بەڵام كە زمان كرا بە دوو زمان، ناشێ بە بڕیارێك یەكتری بگرنەوە و دەیان ساڵ كاركردنی دەوێ پێویستی بەچەند نەوەیەكی نوێ هەیە تاكو بڕیاری یەكگرتنەوەی جێبەجێ دەبێ.

ئەمانە ئەو هەولانە بوون كە لە رابردوودا درابوون ئێستاش دوای رزگاركردنی عێراق و بەتایبەتیش دوای دەرچوونی دەستوری عێراق من وای دەبینم كە زمانی كوردی چۆتە قۆناغێكی ترو پێویستی بە میكانیزمێكی گونجاو هەیە كە جیاواز لەگەڵ قۆناغەكانی تردا، لە لاپەڕەكانی داهاتوو لێی دەدوێین.

## گرفتەکانی نەبوونی زمانی یەکگرتوو

نەبوونی زمانی یەکگرتوو بۆ کورد لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا جگە لە لایەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆتە هۆی دروستکردنی کۆسپی گەورە لەگەلیٚ رووەوە کۆمەلیٚ گرفتی تریشی هێناوەتە ئاراوە لەوانە:

١- نەبوونی زمانی ستاندەر بە شێوەیەکی راستەوخۆ بۆتە هۆی کوشتن و لەناو بردنی بەهرەو توانای نووسەرانی کورد، لەبەرئەوەی نووسەر ناتوانیٚ بەهۆی نووسینەکانیەوە بژێوی خۆیی و ماڵ و منداڵی دابین بکا و خۆی و کاتی خۆی تەنیا بۆ نووسین و داهێنان تەرخان بکا، ناچارە کاری تر بکات و ئەگەر خولیایەکی شێتانەی بۆ نووسین هەبیٚ ئەوا هەندیٚ کاتی دەست بەتاڵی خۆی (کە لەم ڕۆژگارە جەنجالەشدا زۆر کەمە) بۆ نووسین تەرخان بکا. ئەمەش لەبەر ئەوەیە ژمارەی خوێنەران کەمە تەنانەت کە کتێبێك دەنوسیٚ چەندین مانگ شەونخونی بەدیارییەوە دەکێشیٚ ناتوانیٚ چاپی بکات. ئەوپەری ١٠٠٠ دانەی لیٚ چاپ دەکات ئەوانیش بەزەحمەت دەفرۆشرێت پارەی چاپکردنیش دەبیٚ لە دەمی مناڵەکانی بگرێتەوە، کەواتە لێرەدا نووسەر کە کتێبێك چاپ دەکا لە جیاتی ئەوەی کە بەرهەمی بیری خۆی دەفرۆشیٚ پارەیەکی لەجیاتی دەست کەویٚ دەبیٚ پارەشی لەسەر دابنیٚ و زەرەر بکا، کەچی لە وڵاتانی تر کە نووسەرێك بیەویٚ کتێبێك بنووسیٚ، رەنگە هەندێکیان بەر لە دەست کردن بە نووسینی کتێبەکە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە بەربەرەکانێی لەسەر دەکەن و گرێبەستی لەگەڵ دەبەستن پارەی ستایش هەندیٚ جاریش بۆ هەندیٚ بەرهەم کە بازاڕی باش بیٚ پارەی خەیاڵی دەدەنە نووسەر، ئەم دیاردەیە بۆ لای ئێمە نییە، خۆ ئێمەش تا رادەیەك بەرەو بە دەزگابوون (مۆسسە) دەچین، ئەگەرچی لای ئێمە ئەگەر لەبەر خاتری برادەرایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان نەبیٚ کتێب بۆ نووسەر چاپ ناکەن ئەم دەزگایانەش نا هەقیان نییە، چونکە کە کتێب چاپ دەکەن دەبیٚ بیر لەوە بکەنەوە کە بەلایەنی کەمەوە نیوەی ٥٠٪ ی ئەو پارەیەی کە لە کتێبەکە خەرجی دەکەن، بێتەوە دەستیان. زۆربەی



دەزگاکانی چاپکردن لەلایەن حزب یان حکومەت پاڵپشتی مادی وەردەگرن و قەرەبووی ئەو زیانانە دەکەنەوە کە لێیان دەکەوێت، لە کاتێکدا پێویست بوو ئەو دەزگایانە دەسکەوتی ماددی چاکیش بۆ خاوەنەکەی هەبوایە، کەچی بە پێچەوانەوەیە. هۆی ئەمە چیە؟ بێگومان ئەگەر زمانی یەکگرتوو هەبێت، ئەوا ئەو دەزگایانە یان نووسەر دەتوانیٚ ژمارەیەکی یەکجار زۆری کتێب چاپ بکاو بازاڕێکی گەورەشی بۆ دروست دەبیٚ. هەر بۆ نموونە: ئەگەر ژمارەی کورد ٤٠ ملیۆن بیٚ و گریمان لە ٠,٠١٪ لە هەزار کەس یەك کەس کتێبەکە بکریٚ، ئەوا نووسەر دەتوانیٚ (٤٠٠٠٠) هەزار دانەی لیٚ بفرۆشیٚ. با ڕێژەکە بچوکتر بکەینەوە، ئەگەر لە ٢٠٠٠ هەزار کەس یەك کەس کتێبەکە بخوێنەوە، ئەوا (٢٠) هەزار دانەی لیٚ دەفرۆشریٚ، ئەمەشیان ڕێژەیەکی زۆرە لە چاپەمەنیشدا، هەرچەندە ژمارەی دانەکان زۆربێت، ڕێژەی پارەی تێچوونی کەم دەبێتەوە، بەڵام لای ئێمە کە کتێب چاپ دەکریٚ، ئەگەر بە کرمانجی ژووروو بێت، ئەوا بازاڕەکەی تەنیا بریتی دەبێت لە شاری دهۆك و ئەگەر بە کرمانجی ناوەراست، بێت ئەوا بازاڕەکەی بریتی دەبێت، لە هەولێر و سلێمانی ئەمەش بازاڕێکی بچووکە و قازانجی تێدا پەیدانابیٚ، هەر بۆیەش دەزگای چاپ لەلای ئێمە فۆرمێکی سەرمایەداری بۆ دروست نەبووە. مەبەستی قازانج نییە، عەرەبەکان یان ئینگلیزەکان سەدان دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەیان هەیە، ئامانجیشیان قازانجکردنە. بەمەبەش پێشبرکێیەکی ئازاد دروست دەبێت، لە پێشبرکێشدا وەك مێژووی سەرمایەداری بۆی سەلماندوین داهێنان و پێشکەوتن و بەرهەمی چاك لە قازانج و پێشبرکێدا دروست دەبێت. هەر بۆیەش بوونی زمانی یەکگرتووی کوردی دەبێتە هۆیەك بۆ دروست کردنی بازاڕێکی گەورە بۆ ساغ کردنەوە و فرۆشتنی بەرهەمی بیری کورد.

٢- جگە لە بابەتی چاپەمەنی دەشیٚ هەمان خاڵ بۆ بەرهەمهێنانی فیلمی سینەمایی و تەلەفزیۆنی دووبارە بکەینەوە، کۆمپانیای بەرهەمهێنانی

سنیەمایی یان تەلەفزیۆنی ئەمڕۆ ڕەواجێکی زۆر چاکتری هەیە لە کتێب، چونکە هەموو کەسێك و هەموو تەمەنێك سەیری دەکا، بەڵام لەبەر نەبوونی زمانی یەکگرتوو وایکردووە کە بازاڕ بۆ فیلم پەیدا نەبێ، نەبوونی بازاڕیش هۆی دروست نەبوونی قازانجە (سوود)، نەبوونی قازانجیش پێشبڕکێ و بازاڕی ئازاد دروست ناکات کە ئەمانەش نەبن، ئەوا ناشێ چاوەڕوانی داهێنان بکرێت، ئەگەر تاك تاکە نەبێ[1].

٣- کتێبخانەی کوردی زۆر هەژارە، کتێبی هەمە چەشنەی کەمە، ئەو کتێبانەی کە لە کتێبخانەی کوردیدا بەرچاو دەکەون، بریتین لە بابەتی ئەدەبی، مێژوویی، سیاسی، ئایینی چەند کتێبێکی فەلسەفیش، ڕێژەی زۆری کتێبەکانیش ئەدەبین بەهەموو لقەکانیەوە شیعر و پەخشان و ڕەخنە و ژیاننامە و ڕۆمان و چیرۆك..هتد، هەرچەندە ئەمانەش لە ئاستی پێویستدا نییە، ئەگەر بپرسن چەند کتێبمان لەبارەی فیزیاوە هەیە؟ یان لە بواری ماتماتیك و کیمیا و وەرزش، پزیشك و ئەندازە و ئەتۆم و...هتد هەیە؟ بێگومان وەڵامەکەی یان هیچە یان ئەوپەڕی یەك دوو کتێبە، سەیر ئەوەیە کە (پێنج) زانکۆمان هەیە و خوێندن تیایاندا بە کوردییە؟

تەنانەت ماوە ماوە ڕێکخراوەکانی قوتابیان و خوێندکاران و فێرخوازان...هتد بە جورئەتەوەش بەبێ شەرم کردن لە حاڵی کتێبخانەی کوردی دەڵێن دەبێ مەنهەجی خوێندن بکرێ بەکوردی!!. چۆن مەنهەج دەکری بە کوردی لە

---

[1] لە نیوەی دووەمی نەوەتەکاندا بوو بە مۆدێل هونەرمەندانی کورد (گۆرانی بێژەکان) فیلمیان دەردەهێنا زۆر بەشیان ئەو پارەیان لە فرۆشتن و نمایش کردنی بەرهەمەکانیان دەست نەکەوتەوە، کە تێدا خەرجیان کردبوو، هەرچەندە بەرهەمەکان لە رووی هونەرییەوە ئەوەندە باش نەبوون، لاوازی لەرووی هونەری ئەم بەرهەمانە و بەردەوام نەبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی بازاڕی فراوان. ئەمەش هۆیەکی سەرەکییە بۆ دروست نەبوونی پێشبڕکێی کۆمپانیای بەرهەمهێنانی فیلم. جگە لە بەرهەمهێنان تەنانەت نەبوونی کۆمپانیا بۆ دۆبلاژکردنی فیلم دەچێتە ناو ئەو خانەیەوە.



حاڵەتێکدا چوار کتێب لە کتێبخانەکاندا نەبێ، ئەو کاتە پێویستە داوای ئەوە بکرێ کە سەدان کتێب بەڵکو هەزاران باس و لێکۆڵینەوە لە هەر بوارێکی زانستی لەبەردەست دابێ و ڕۆژانەش کتێبە نوێیەکان وەربگێڕدرێنەوە سەر زمانی کوردی، وەك ئەوەی کە فارسەکان دەیکەن، تەنانەت کتێب هێشتا بە زمانی ئینگلیزی نەکەوتۆتە بازاڕەکانی جیهان وێنەی وەرگێڕدراوی لە ئێران دەفرۆشرێ. ئەمەش بەوەی کە گرێبەستیان لەگەڵ زۆر لە دەزگاکانی بڵاوکردنەوە هەیە. تەنانەت بۆشیان وەردەگێڕن، خۆشیان چاپی دەکەنەوە. نوێترین سەرچاوە لەهەر بوارێکدا کە پێویست بێ بەزمانی فارسی لەبەردەست دایە.

ئایا ئێمەی کورد کەسمان نیە لەم بوارانەدا پزیشك، فیزیا، کیمیا...هتد شارەزابێ و کتێبێك چاپ بکا یان وەرگێڕێ؟ بێگومان هەمانە ئەوەتا سەدان کادیر و پسپۆر لە زانکۆکاندا ئەم بابەتانە دەڵێنەوە. ئایا بۆچی بەرهەمیان نییە؟ دەشێ مامۆستای زانکۆ بێ و پێی بگوترێ لێکۆڵەر و بێ بەرهەم بێ؟ بێگومان نەخێر. بەڵام بەرهەمی بیریان بەکوردی دانارێژن بەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی بەرهەمەکانیان دەنوسن و کتێبخانەی عەرەبی و ئینگلیزی دەوڵەمەند دەکەن، کورد دەڵێ (تا ماڵ هەبێ مزگەوت بەتاڵە) بەڵام لای ئێمە بە پێچەوانەوەیە ماڵەکەمان بێ بەرەو رایەخە. ئەو رایەخ و بەرە نازدارانەی دەستمان دەکەوێ دەیبەینە مزگەوت، کەچی مزگەوتیش پێویستی پێی نییە، هەموو خەڵکیش ڕۆژانە بەرەو رایەخی تازەی بۆ دێنێ. ئایا دەسەڵاتی کوردی بیری لەوە کردۆتەوە کە چۆن کتێبخانەی کوردی دەوڵەمەند بکا؟ ئایا بیری لەوە کردۆتەوە هۆکاری هەژاری و نەبوونی سەرچاوەی کوردی دەست نیشان بکا؟ و هانی وەرگێڕان و دانان بدا؟ من وای دەبینم کە تا ئێستا ئەم بابەتە بەلایەوە زۆر لاوەکییەو حیسابێکی وای بۆ نەکردوە؟ تەنانەت وەك واقیع لەبەرچاوماندایە سەدان بارەگای حزبی و مزگەوت لەشارێکی وەك هەولێردا هەیە، لە هەر گەڕەکێك ڕێکخراوێك و کۆمیتەیەك و چەند مزگەوتێك هەیە. بەڵام بەهەموو پایتەخت کە پایتەختی هەرێمی وڵاتێکە تەنیا یەك کتێبخانەی لێیە!! ئەو کتێبخانەیەش حاڵی چۆنە

وەك نەبوو وایە؟ ئەو کتێبخانەیەش بە باڵاخانە و کتێبەکانیشی میراتی ڕژێمی بەعسە و خۆمان دامان نەمەزراندووە. سیستەمی کتێبخانەکەش بەجۆرێکە تەنانەت پێرست و ئیندێکس نییە؟ کتێبی تێدا نادۆزرێتەوە. دیارە مامۆستایانی زانکۆی ئێمەش بەرهەمەکانیان (کە بەرهەمی بیری نەتەوەی کوردە) بە عەرەبی یان ئینگلیزی دەنوسن، بەبێ هۆ نییە. ئەویش نەبوونی زمانی یەکگرتووە و جگە لەمەش لەم قۆناغەدا میری دەشێ یارمەتی یان راستر بڵێین مامۆستایان هان بدا بۆ ئەوەی بابەتە زانستییەکان وەرگێڕێ و لێکۆڵینەوەکانیان بەکوردی بنوسن. چونکە بەم حاڵەی ئێستا زۆربەی زۆری بەرهەمی بیری کورد بە فیڕۆ دەڕوا و نەوەی داهاتوو سوودی لێ نابینێ. دەبێ ناچار بێ فێری زمانی عەرەبی یان ئینگلیزی ببێ بۆ ئەوەی سەرچاوەی تازەی دەست بکەوێ! من دژی ئەوەنیم کە قوتابی کورد زمانی تر بزانێ، بەڵکو زۆر بەتوندی پشتگیریشی دەکەم، بەڵام دەبێ ئەوەش بەبەرچاوەوە بگرین نەوەی ئێستا لە کوردی زیاتر هیچ زمانێکی تر نازانێ، جگە لەوە ئەگەر فێری ئینگلیزی یان عەرەبیش کرا و سەرچاوەکان تەنیا بە زمانی بیانی بوون، ئەوا راستەوخۆ ئەوانیش دەبنە دیلی ئەو زمانە بیانیانە و بەیانی ئەوانیش ناتوانن بەکوردی بەرهەمەکانیان بنووسن، وەك ئەو مامۆستایانەی ئێستا کە بەکوردی قسە دەکەن، بەڵام بەرهەمەکانیان بەزمانی تر بڵاودەکەنەوە، ئیتر تاوای لێ دێ چەند نەوەیەکی تر تەنیا زمانی کوردی بۆ گفتوگۆ بەکار دەهێنێ و ئەو بیرە لەلای دروست دەبێ کە زمانی کوردی بۆ زانست دەست نادا، ئێستا وا خەریکە ئەم بیرە سەرهەڵبدا. خۆ ئەگەر حکومەت بەرنامەی دارِشت و سەدان سەرچاوەی کوردی لە بوارە جیاجیاکاندا خستە بەردەستی قوتابیان و خوێندکاران، ئەوا نابێتە کۆسپ لە ڕێگای فێربوونی زمانی ئینگلیزی یان عەرەبی. بەراشکاوی دەڵێم ئێستا قوتابیی فارس هیچ کاتێك هەست بە گرفتی نەزانینی زمانی ئینگلیزی و کەمی سەرچاوە بە زمانی فارسی ناکا.



پێویستە دەسەڵات بیریش لەوە بکاتەوە کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا جیهان بووە بە گوندێکی بچووك، عەولەمە وڵاتی ئێمە و هەموو دونیای داگیرکردووە، گەلی کورد لەو بازاڕی عەولەمەیەدا خاوەنی چییە؟ ئەگەر تەنیا کڕیارێك بێ و هیچ لەخۆی نەکڕێ، ئەوا کاریگەرییە سلبییەکان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی و هەستی نەتەوەیی زیاتر دەبێ. هەرچەندە لەم ڕۆژگارەدا ناتوانین ببین بە فرۆشیار، لەم بازاڕەدا تاکو کاریگەریمان لەسەر کڕیارەکانمان هەبێ. بەڵام با هەوڵبدەین سەداسەدی کاڵاکان و سەرچاوەکان نەکڕین بەشێك لەو کاڵایانە دەسکردی خۆمان بن بۆ ئەوەی سەداسەد نەکەوینە ژێر کاریگەرییە سلبییەکان لەسەر هەستی نەتەوایەتی[1]، لێرەدا مەبەستم لە کاڵاو کڕین و فرۆشتن لە بازاڕی عەولەمەدا ئەوەیە، چەند کتێب و زانیاری لە زمانەکانی تر وەردەگری و چەندیش هی خۆتن یان تۆ چەند بە وڵاتانی تر دەبەخشی.

[1] - ئەمڕۆ چەند تاکی کورد زاتی ئەوە دەکا وەك تاك خۆی لەگەڵ ژاپۆنییەك یان ئەڵمانییەك بەراورد بکا، یان نەتەوەکەی خۆی لەگەڵ نەتەوەی ژاپۆن و ئەڵمان بەراورد بکا؟ بۆچی ئەوانی پێ لە خۆی چاکترە؟ دروست بوونی ئەم هەستە نیشانەی بە کەم زانینی خۆیەتی وەك کورد، بۆ تورکێك ئەو هەستەی لەلا نییە، یان فارس و عەرەب و ئەڵمانی... هتد. هەمیشە هەر تاکێك لەم نەتەوانە نەتەوەکەی خۆی پێ باڵاترە لە نەتەوەکانی تر. کەچی کورد هەستی خۆ بەکەمزانینی لەلا دروست بووە.
ئایا دەسەڵاتی کوردی بیری لەو دیاردەیەو چارەسەرکردنی کردۆتەوە؟ بەرای من هەستی خۆبەکەمزانین هۆکاری زۆرن، یەکێك لەو هۆکارانە ئەوەیە کە لە بازاڕی عەولەمەدا تەنیا کڕیارین، تا نەبین بە فرۆشیار ئەو شانازییە لەلامان دروست نابێ، ئێستا خاوەنی کەرستەیەکی ئەوتۆ نیین جا مادی بێ یان نامادی کە شانازی پێوە بکەین، هەر بۆیەشە بە هەموو توانای خۆمان هەوڵدەدەین ئەو شانازییە لە مێژووی بەسەرچوماندا بدۆزینەوە. کە دەگوترێت ئەمساڵ فلان فیلمی کوردی لە ڤیستیڤاڵی سینەمایی جیهانی خەڵاتی ئۆسکاری وەرگرت. ئەوا ئەو شانازییە لەلامان دروست دەبێ. یان کە دەگوترێ فلان تیپی وەرزشی کوردی بەسەر فلان تیپدا سەرکەوت، ئەوا ئەو شانازییە لەلامان دروست دەبێت، مەرج نییە ئێمە لەم بازاڕە گەورەیەی عەولەمەدا بە ئامێری ئەلیکترۆنی و کۆمپیوتەر بەربەرکانێی کۆمپانیای مایکرسۆفت بکەین یان بە ئۆتۆمبێل بەربەرکانێی کۆمپانیا ژاپۆنی و ئەڵمانییەکان بکەین، ئەگەر ئەمانەشمان پێ نەکرێ ئەوا دەتوانیین لە بواری هونەر و ئەدەب و وەرزش...هتد بەلایەنی کەمەوە بوونی خۆمان بسەلمێنیین.

٤- له رۆژگاری ئەمڕۆدا کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت باڵی بەسەر هەموو بوارێکی ژیاندا کێشاوە، خزمەتگوزارییەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنیت بەهەموو زمانێك پێشکەش دەکریت، بۆ نموونە کە کۆمپانیای مایکرۆسوفت (ڤێرژن) مۆدیلێکی نوێی ویندۆز دادەهێنی، ئەوا لەگەڵ بڵاوبوونەوەی وێنە ئینگلیزیەکەی، بەزمانی عەرەبی و فارسی و تورکی...هتد وێنەی دەکەوێتە بازاڕەوە. بۆچی کورد بەرنامەی کۆمپیوتەری بەزمانی خۆی نەبێت؟ ئەگەر هەشی بێت بەکام زمان بێت؟ ئەمەیان گرفتیکی گرنکەو پێویستە دەوڵەت زۆر بە وریاییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دا بکات. من لەو باوەڕەدام کە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەمڕۆ رۆڵێکی زۆر کاریگەر دەبینن بۆ سەپاندنی زمانی یەکگرتوو کە رۆڵیان هیچ لە رۆڵی وەزارەتی پەروەردە کەمتر نییە. ئەگەر توانرا ویندۆز و بەرنامەکانی بە زمانیکی دیاریکراو بڵاوبکرێتەوە، ئەوا ئەو زمانە زوو گەشە دەکات و بڵاو دەبێتەوە، چونکە بەکارهێنەری زۆرە...

لە رۆژگاری وەك ئەمڕۆ تاکە یەك بەرنامەش بەزمانی کوردی نەبێت، چۆن مافی ئەوە بدەینە خۆمان و بڵێین پێشکەوتووین بە چ هێزیك بەرگری لە شالاوی عەولەمە دەکەین، ئێمە خۆمان ئێستا لەم بوارەدا وا دەبینین، وەك ئەوەی گوندێکی دوورەدەست بین و لەگەڵ پایتەختێکی گەورە بەراورد بکرێن. پێویستە دەسەڵات بیر لەوە بکاتەوە کە مەڵبەندێکی نیشتیمانی دابنی بۆ گەشەپێدانی بوارەکانی کۆمپیوتەر بە هاوکاری کۆڕی زانیاری، چەند پسپۆڕێك لە زاراوە و دانانی بۆ ئەوەی زمانێکی یەکگرتوو لە ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر و مۆبایلدا دروست بکەین.

لێرەدا خالێکی زۆر گرنگ هەیە و هەلێکی چاك رەخساوە پێویستە لەدەست نەدرێ، ئەویش ئەوەیە لەم بوارەدا تا ئێستا هیچ نەکراوە. واتە لە خالی سفر دەست پێ دەکرێ، دوو زمان یان دوو شێوەی جیاواز دروست نەبووە تا ململانێ



لە نێوانیاندا هەبێ. بۆیە دەبێ بەرنامەیەکی تۆکمە دابڕێژرێ و لەم بوارەدا تا کات بەسەرنەچووە یەك زمان بۆ کۆمپیوتەر و زانستەکانی دابڕێژرێ.

٥- کورد چەند پێویستی بە یەکێتی و یەکریزی هەیە لەرووی سیاسی و هەڵوێستی سیاسییەوە زۆر لەوە زیاتر پێویستی بە یەکبونی توانا فیکرییەکان هەیە، رەنگە ئەگەر لە هەڵوێستە سیاسیەکانیشدا یەك نەبین، بۆ نموونە دوو هەڵوێستی جیاواز لە ئارادا هەبێ، ئەوا رەنگە دوو هەڵوێست کە زیانێکی کاتی هەبێت رۆژیك لە رۆژان یان لە هەرکاتێکدا پێویست بێ هەڵوێستەکان یەك بخرێ، بەڵام یەك نەبوونی توانای فیکری کورد و دابەشبوونی عەقڵی کورد زیانێکی هەمیشەیی دەبێ نەك کاتی. بە ئاسانیش یەك ناخرینەوە، تەنانەت دەسەڵاتی سیاسیش ناتوانێ بە بڕیارێکی سیاسی تواناو بەرهەمەکانی بیری کورد ئەگەر دابەش بێ یەکیان بخاتەوە، با ئەم وتەیە بە شێوەیەکی سادەتر بخەمەروو، وەك لە خالی سێیەمدا ئەوم خستەڕوو کە کتێبخانەی کوردی هەژارە و قوتابی کورد سەرچاوەی نییە، باوا دابنێین کۆمەڵێ نووسەر بە کرمانجی ناوەڕاست شت دەنوسن. ئیتر قوتابیان یان خوێنەری کرمانجی ژووروو لەو بەرهەمانەنەی کە بەکرمانجی ناوەراست نوسراون بێبەش دەبن، ئەمە نەك تەنیا قوتابییەکان بەڵکو دەگاتە ئاستێك کە خودی لێکۆڵەر خۆشی نەتوانێ سوود لەو لێکۆڵینەوانە وەربگرێ، کە بەزارەکەی تر نوسراون. بەم پێیە نەبوونی زمانی یەکگرتوو بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە راستەوخۆ دەبێتە هۆی دابەشبوون و دووپارچەبوونی عەقڵ و توانا فیکرییەکانی کورد، کە دابەشیش بوو شتەکانی تریش لەگەڵیدا دابەش دەبن، بۆیە بە بڕیارێکی سیاسی چاك نابێتەوە، ئەگەر بگاتە ئەو ئاستە، ئەوا دەبێ ببن بە دوو نەتەوەی جیاواز کە خزمایەتیەکی نەژادی لە نێوانیاندا دەبێ، هەندێ نەتەوە لە رۆژگاری ئەمڕۆ ناتوانن هیچ ریفۆرمێك لە زمانەکەیاندا بکەن بۆ نموونە ئینگلیزەکان یان فەرەنسییەکان ناتوانن دەسکاری رێنوسەکانیان بکەن، هەرچەندە خۆیان دان بەمەدا دەنێن کە گرفتی گەورەیان

له ڕێنوسدا هەیە. ئەوان گەیشتونەتە قۆناغێك کە دەسەڵاتی دەسکاری کردنیان نەماوە، تازە ناچارن چۆن ڕۆیشتووە هەروا بەکاری بهێنن، نە توانای مادییان بەشی ئەوە دەکات ئەم هەموو نواسراوانە سەرلەنوێ بنوسنەوە نە توانای مەعنەویشیان وەك لێراهێنانی نووسینی نوێ و...هتد لە ئاستی بڵاوی زمانەکەیاندایە. نەك هەرتەنیا لە زماندا تەنانەت ئینگلیزەکان سیستەمی هاتوچۆی ئۆتۆمبیلیان پێچەوانەی هەموو جیهانە، بەڵام لەم قۆناغەدا ناتوانن دەسکاری بکەن و وەکو وڵاتانی تری لێ بکەنەوە، ناچارن هەر لەسەر سیستەمی خۆیان برۆن.

٦- دوو ستاندەری، بارێکی قورسی خەرجی لە رووی ئابوورییەوە دەخاتە سەر شانی میری و هاوڵاتیان. ئەو وڵاتانەی کە بە شێوەی فەرمی دوو ستاندەریان تێدا بەکار دێت، ساڵانە باجێکی یەکجار زۆری دوو ستاندەری دەدەن، بۆ نموونە: کەنەدا کە دوو زمانی فەرمی (ئینگلیزی و فەرەنسی) تێدا بەکاردێت. سالانە رێژەی ١٪ لە بودجەی فیدرالی بۆ ئەم مەبەستە خەرج دەکرێ. لە ساڵی ١٩٧٨بڕی ٥٠٣ ملیۆن دۆلاری کەنەدا لە دوو ستاندەری خەرج کراوە. لە بەلجیکا پاش کەوتنی حکومەتی سەرۆك وەزیران (مارتنز) لە ساڵی ١٩٨٧دا بە هۆی کێشەی زمانییەوە لە دوای گفتوگۆ و دانوستاندنی پێنج مانگی بڕیادرا کە دەسکاری دەستوور بکەن، شانشینی بەلجیکا لەسەر بنەمای زمان بکرێتە وڵاتێکی فیدرالی. ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر بودجەی دەوڵەت چەندین پرۆژە و بەرنامەیان هەڵوەشاندەوە، بابەتی خەرجی فرە زمانی جێگای گرتەوە بۆ ئەمەش یاسای دارایی ناوچەییان دانا. پسپۆرانی ئەم بوارە. تەنیا فێربوونی زمانی ئەڵمانی لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨دا بە بڕی چوارده بلیۆن فرانکی بەلجیکی مەزەندە کرد[1].

---

[1] فلوريان كولماس، اللغة والاقتصاد، ترجمة: د. احمد حوض، ٢٠٠٠: ١٣٨.



## کورد و دوو ستاندەری

ئەمە لە زمانی کوردیشدا ئێستا دوو ئاراستە بەدی دەکرێ و لە پێناو دوو ئاراستەدا کاری جدی (بەناهۆشیارییەوە) دەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە دوو زمانی یەکگرتوو دروست بکرێ، لە واقیعیشدا ئەم هەنگاوانە یان ئەم هەوڵانە ئامانجی خۆیان پێکاوەو کورد دەستی بەوە کردووە کە دوو زمانی ستاندەر دروست بکات، بەڵام ئەوە هێشتا نەگەیشتۆتە ئەم ئاستەی کە ئەم دوو زمانە بەیەکگرتووە بەتەواوی جێگیر ببێ و بچەسپێ. باوەڕم وایە کە هێشتا بواری ئەوە ماوە رێگا لەم دەست پێکردنە بگیرێ و رێگای چەسپاندنی نەدرێ، چونکە کە چەسپا و جێگیر بوو ئەو کاتە دوو هەستی جیاوازیش لەلای بەکارهێنەرانی دروست دەبێ (کە هەرچەندە ئەو هەستەش تا رادەیەك هەیە). لە کۆتایشدا دوو نەتەوەی جیاواز دێتە بەرهەم، بۆیە ئێستا ئەرکێکی سەرەکی و گرنگی دەسەڵاتی کوردییە کە کار بۆ رێگرتن لە دابەشبوونی زمانی کوردی بکا. ئەمەشیان پێویستی بە ئیرادەیەکی بەهێز هەیە، هەرچەندە من باوەڕم وایە کە ئێستا دابەشبووە، بارودۆخی گوتنەوەی وانەی زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی شاری دهۆك و هەولێر ئەو راستیە دەسەلمێنن. تەنانەت کتێبە مەنهەجییەکان کە بەدوو زار نوسراون، هەوڵێکی نەزانانەیە بۆ پینەکردنی ئەم بارە و لە هەمان کاتیشدا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ هاندەرێکە بۆ دابەشبوونەکە، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕم وایە ئەگەر دەسەڵاتی کوردی ویستی هەبێ، ئەوا دەتوانێ بەبڕیارێکی سیاسی و بەرنامەیەکی تۆکمە ئاراستەی ئەم دیاردەیە بگۆڕێ و بەرەو یەکبوونی ببات. چاککردنی ئەم دیاردەیەو گۆڕینی ئاراستەکەی بەلای بەرژەوەندی باڵای نەتەوەیی گرفتی دێتە پێش و کارێکی ئاسان نییە. بەڵام بەو رێژەیەش گران نییە کە کەمال ئەتاتۆرك بۆ زمانی تورکی کردی. لەپێناو بەرژوەندی نەتەوەیی تورك بڕیاریدا

ئەلفوبێی عەرەبی بگۆڕی و بیکات بە ئەلفوبێی لاتینی هەرچەندە بڕیارێکی وا بۆ ئەو کات گەلێ دژوار بوو لەبەر ئەوەی تورکیای دۆڕاوی شەڕ لەڕووی ئابوورییەوە داتەپیبوو وەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆ ئامێری چاپ و کەرستەی تەکنەلۆژی بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجە نەبوو، سەرەڕای ئەمانەش وڵاتی عوسمانلی خاوەنی گەنجینەیەکی یەکجار گەورەی کتێب بوو، دووبارە نووسینەوەی ئەو سەدان هەزار کتێبە چۆن ئەنجام درا، کە نەوەی نوێش لە خوێندنەوەیان بێبەش دەبوون ئەگەر نەیانگۆڕیبایە سەر ئەلفوبێی لاتینی. لەگەڵ بوونی ئەو گرفتە گەورانەش لەبەر ئەوەی کەمال ئەتاتۆرك ئیرادەی هەبوو، بڕیاریدا و توانی سەرکەوتنیش لەم هەوڵەدا بەدەست بهێنێ و بە بۆچوونی ئەو بەرژەوەندی نەتەوەی تورك لەوەدابوو. کەچی ئەو ترسەی ئەمڕۆ لەسەر زمانی کوردی و دابەشبوونی زمانی کوردی هەیە، زۆر گەورەترە لەو ترسەی کە (کەمال ئەتاتۆرك) لەسەر زمانی تورکیی هەیبوو، ئەوان ئەگەر بە ئەلفوبێی عەرەبیش بیان نووسیبایە هیچ ترسێك لەسەر ئاسایشی نەتەوەییان دروست نەدەبوو.

بەڵام ئێمە کە زمانەکەمان لە بارودۆخێکدایە کەوتۆتە ژێر هەڕەشەی دوولەت بوونەوە، هەڕەشە لە ئاسایشی نەتەوییمان دەکا، بۆ دەبێ بەڵامانەوە گران بێ. چۆن دەکرێ فەرامۆش بکرێ، دانانی پڕۆژەیەکی تۆکمە بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی ئەوەندە گرفتەی لەبەردەمدا نییە، کە تورکەکان بۆ ڕێنوس گۆڕین هەیان بوو. واتە گرفتەکەی ئێمە لە هی ئەوان بچوکترە و ئامانجی ئێمەش لە ئامانجی ئەوان گەورەترە. لەبەر ئەوەی ئێمە ترسمان لە داهاتوو هەیە، بۆیە بە باوەڕەوە دەڵێم ئەگەر ئیرادەیەکی بەهێز هەبێ ئەوا، هەوڵدان بە فیرۆناچێ و ئەو کەسەی ئەم هەوڵەش بدا، ئەوا ناوی لە مێژووی زمانی کوردیدا وەك (دانتی) ئیتالییەکان و (مارتن لۆسەر)ی ئەڵمانی، بە شانازیەوە تۆمار دەکرێ، نەوەکانی داهاتووش و ڕۆشنبیرانی دوارۆژیش بەرێزەوە ئەو خزمەتە نەتەوەییە هەڵدەسەنگێنن.



## پرۆژەی زمانی ستاندەر

دەستکردن بە پڕۆژەیەکی وا گەورە، لەلای ئێمەی کورد کۆمەڵێ گرفت و کۆسپی لەبەردەمدا هەیە. کە ناشێ پشتگوێیان بخەین، بە پەسندی دەزانم لێرەدا کۆسپەکان بخەمەڕوو:

١- گەورەترین کۆسپ کە لەبەردەم بوونی زمانی یەکگرتووی کوردیدایە، ڕەوتی ناوچەگەرێتییە، بەداخەوە لە ڕاپەڕینەوە تا ئێستا پارتە کوردییەکان کەمتر کاریان بۆ ئەوە کردووە کە ئینتیمای نەتەوەیی لەلای تاکی کورد لەسەرووی ئینتماکانی تری وەك: حیزبی، ناوچەیی، عەشیرەتی...هتد دابنێن. هەربۆیەش هەستی ئینتمای ناوچەیی یان حزبی زاڵە لەلای تاکی کورد، بوونی هەستی ناوچەگەرێتی دیاردەیەکی ئاساییەو دەشێ خزمەتی چاکیشی لێ وەبەربهێنرێ، تەنانەت ئەگەر کەسێك ناوچەکەی یان شارەکەی خۆی خۆش نەوێت. ئەوا چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناکرێ کە وڵات و نەتەوەکەی خۆی خۆش بوێ. بەڵام لای ئێمە کۆسپەکە لەوە دایە و جیامان دەکاتەوە لە گەلانی تر، ئەوەیە ئەم هەستە لەلای ئێمە زاڵە بەسەر هەستی نەتەوایەتیدا. واتە گرفت و کۆسپی یەکەم بە گرفتێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێ.

٢- کۆسپی دووەم بەرهەمی ڕووداوە مێژووییەکانە و دروستبوونی لەژێر دەسەڵاتی سەرکردایەتی سیاسیی کوردا نەبووە، ئەویش پارچە پارچە بوونی کوردستانە. ئەگەر ئێستا بڕیاریش بدرێ بۆ زمانی یەکگرتوو، ئەوا دەسەڵاتێك نییە بتوانێ لە کوردستانی گەورەدا جێبەجێ بکات، هەروەك لە ڕابردوشدا ئەم بڕیارانە دراون وەك کۆنگرەی کوردناسان لە یەکێتی سۆڤیەتی ساڵی ١٩٣٤ و بڕیاری کۆنگرەی یەکێتی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە ساڵی ١٩٥٩، بڕیاردرا بەڵام نەتوانرا جێبەجێ بکرێ، ئێستاش هەمان بارودۆخە. چۆن بتوانین بەم بڕیارەی کە دەدرێ لەسەرتاسەری کوردستان جێبەجێ بکرێ؟

٣- کۆسپێکی تریش لەبەردەم ئەم هەوڵەدایە ئەویش ئەوەیە چۆن ئەم شێوەزارانەی زارەکان فێربکرێن کە بەزمانی ستاندەر بخوێنەوەو بنووسن، ئایا توانای لۆجست و ماددی دابین کردنی ئەو ژمارە پسپۆرە هەیە؟ یان نا؟

## چارەسەری کۆسپەکان

بوونی ئەو کۆسپانەیە کە نەیهێشتووە تا ئێستا زمانی ستاندەر بۆ کورد دروست ببێ. ئەگەر ئەم کۆسپانە لەئارادا نەبوونایە ئێمەش باسمان لە کێشەیەکی وانەدەکرد و تەنانەت کێشەیەکی لەو بابەتەش بوونی نەدەبوو. هەر بۆیە پێویستمان بە کارکردن هەیە لەسەر کۆسپەکان و لابردنی کۆسپەکان، زۆرتر لەوەی لەسەر زمانەکە کاربکەین. ئەم سێ کۆسپەش بەقەد ئەو کۆسپانە گەورە نین، کە لە بەردەم (کەمال ئەتاتۆرك)دا هەبوو بۆ رێنوسی تورکی، بۆیە ئەو کۆسپانە لەو ئاستەدانین کە جێبەجێکردنی پرۆژەکە بکاتە شتێکی ئاستەم (موستەحیل) لەخوارەوەش چارەسەری کۆسپەکان یەکە یەکە دەخەینە روو:

### کۆسپی یەکەم:

هەستی ناوچەگەرێتی و خۆشویستنی زار لەلای هەموو گەلێك هەیە و دیاردەیەکی ئاساییە، بەڵام لەلای گەلانی تر هەستی نەتەوایەتی بە هێزترە، لای ئێمەی کوردیش هەستی نەتەوایەتی بەهێزە دەشێ کۆمەڵێ بەڵگە بهێنینەوە بۆ ئەم دیاردەیە وەك ئەو هەستەی لەلای تاك و کۆمەڵی کورد دروستبوون. لە کاتی کە تورکیا بەنیاز بوو بۆ ئازادکردنی عێراق لەشکر بهێنێتە کوردستان یان کە راپەرین لە پارچەکانی تری کوردسان دروست دەبێ یان نارازیبوونی خەڵك لە حزبەکان، کەچی لە کاتی هەڵوێستی نەتەوایەتیدا دەنگی بۆ دان لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٥ هتد. دەیان بەڵگەی زیندووی تر کە خۆمان دەیان بینین، بەڵام ئەم هەستە پەنگخواردووە شاراوەیە گەر کاری لەسەر بکرێ دەتوانرێ بەئاراستەیەکی چاك بقۆزرێتەوە و سوودی لێ وەربگیرێ و لەم قۆناغەدا زاڵ بکرێ بەسەر هەستی ناوچەیی یان لەهجەیی تا نەوەیەکی نوێ پێ دەگات.



باوا دابنێین کە دەسەڵات بڕیاریدا زارێك بکات بە زمانی ستاندەر، ئایا کاردانەوەی زارەکەی تر چی دەبێ؟ ئایا لە رۆژنامەکاندا شت دەنوسن لە دژی ئەگەر وابێ ئەوا سەدان نووسەر پشتگیری ئەم هەوڵە دەکەن، یان ئایا خۆپیشاندان سازدەکەن، باوەڕناکەم هەنگاوی ئاواش بێتە ئاراوە، چونکە بەراشکاوی دەیڵێم خەڵکی ئێمە بیرکردنەوەی لە ژێر دەستی خۆیدا نییە، بیرکردنەوەیان یان هەڵوێستیان لە ژێر کاریگەری سەرکردایەتی دایە، تەنانەت سەرکردایەتی بە چ ئاراستەیەکدا بیەوێت دەیان جوڵێنێ. بەرادەیەك شەڕی براکوژی گەورەترین نەگبەتی بوو لە نەوەدەکان باڵی بەسەر نەتەوەی کوردا کێشاو لە قۆناغێکی زۆر ناسکی مێژوودا لە دژی بەرژەوەندی نەتەوەیدا بوو، کەچی جەماوەر نەك دژی نەبوو، بەڵکو بەشداریشی تێدا کرد. تەنانەت خەڵك لەنێو خێزانەکانیاندا ببون بە دوو گرووپی دژ بەیەك. کاتێك سەرکردایەتیش ویستی ئاشتبێتەوە بەلیستێك بەشداری هەڵبژاردنیان کرد، ئەوا ئەم خەڵکە کە پێشتر دژی یەکتر بوون بەیەکەوە دەنگیان بۆ دان. ئیتر کە نەتەوەیەك وا سەیری دەسەڵاتی خۆی بکات کە گوتی ئەوە رەشە هەمووی بەیەك دەنگ بڵێت رەشە و کە گوتیشی سپیە هەموو پێکرا بڵێن سپیە، چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناکرێ، کە سەرکردایەتی بێ بڵێ ئەمە بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی چاکە، ئەو دەجار پێی بڵێ دەك دەستت خۆش بێ دەسەڵاتی سیاسی بەرادەیەك زاڵە بەسەر هەستی کوردا کە ئەگەر بەیانی خوا نەکات بیەوێت شەڕی براکوژی بکاتەوە، تەنیا دوو رۆژ راگەیاندنەکانیان بەگەڕ بخەن یان تەنیا بەیاننامەیەك دەربکەن، ئەوا هەستی شەڕانگێزی لەلای ئەم جەماوەرە فەقیر حاڵە دروست دەکەن، لێرەشدا ئەمە بۆیە دەخەمەڕوو مەبەستم ئەوەیە کە بەرپرساریەتی هەستی ناوچەگەرێتی یان نەتەوایەتی تەواو بخەمە ئەستۆی سەرکردایەتی کوردەوە، دەمەوێ ئەوە روون بکەمەوە کە ئەو بەرپرسیاری یەکەمە لە چارەسەرکردنی کۆسپی یەکەم زۆر بە ئاسانی بەیەك بەیاننامە یان دەرکەوتنی کاتژمێرێك لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە

زەمینە خۆش دەکات و ئەو هەستەش کە پێویستە دروست دەکـات تەنانـەت لـە جیاتی کاردانەوەی سلبی و خۆپیشاندان کە مەحاڵە هەبێ، ئەوا بـۆ بەیانیەکـەی رۆژنامەکان پڕ دەبن لە وتاری دەستخۆشی و تا مانگێکیش درودو ستایش بۆ ئەم هەڵوێستەی دەنێرن.

**کۆسپی دووەم:**

یەکێك لە کۆسپە هەرەگەورەکانی دروست نەبوونی زمانی کـوردی لـە رابـردوودا دابەشبوونی کوردستان بوو بەسەر چەند وڵاتێکی دراوسێدا بە داخـەوە ئـەوانیش رێگای ئەوەیان نەدەدا، کە زمانی یەکگرتوو دروست بێـت. دەسـەڵاتی جێبـەجێ کردنیش لەدەست کورد خۆی نەبووە، هەرچەندە کورد خۆی ماوەیەکە هەستی بـە پێویستی بـوونی زمـانی سـتاندەر کـردووە و بەرنامەشـی بـۆ دارشـتووە بـەڵام دەسەڵاتی جێبەجێکردنی نەبووە، ئەمڕۆ رۆژگار گۆڕاوە ئەو هەمـوو تەکنـەلۆژیاو پێشکەوتنەی لە بواری میدیا و راگەیاندندا پەیدابوون کـە جیهـانی کـردووە بـە گوندێکی بچووك، ئایا زەمینەی خۆش نەکردووە بۆ ئەوەی لـەم گونـدە بـچوکەدا دەسەڵاتی چەسـپاندنی زمـانی یـەکگرتوو دروسـت بکـەین، راسـتە جـاران زۆر زەحمەت بوو تا مامۆستایەك دابین بکەی لە شـارو شارۆچـکەو گونـدەکان وانـەی زمانی کوردی بڵێنەوە، بەڵام ئەمڕۆ بە پێـچەوانەوە، زۆر بـە ئاسـانی دەتـوانرێ تەکنەلۆژیا و میدیا و عەولەمە وەکو هەموو خەڵکی تر بە کاربهێنرێ بۆ ئامانجە نەتەوەییەکان، راستە ئەمڕۆش هەر کوردستان دابەشکراوە بەسەر چوار پارچـەدا، بەڵام تەکنەلۆژیای گەیاندن توانییەتی هەموو دنیا بکا بەیەك ئیتر ئەمە کۆسپێ نییە، چونکە ئێمە کارمان بەهەموو دنیانیە تەنیا کارمان بـە کوردەکـانی دنیـا هەیە کە ئەویش خۆی بۆمان بووە بەیەك پارچە لە راگەیاندندا.

ئەمڕۆ بارودۆخی سیاسی کوردستان لای هەموومان روون و ئاشکرایە کە تەنیا لە کورستانی باشوور دەتوانێ کار بۆ ئەم پرۆژەیە بکرێ، ئەمڕۆ هەرێمی کوردستانی



عێراق بۆتە بنکەیەکی دەسەڵاتی کوردی و دەتوانێ بڕیارەکـانی خـۆی جێبـەجێ بکا. بەشەکانی تری کوردستانیش چاویان بڕیوەتە ئێمە. لەو باوەڕەدام کە ئێـرە، کوردسـتانی باشـوور بۆتـە گۆڕەپـانی یەکلاکردنـەوەی کێـشەکە، چـونکە لـە کوردستانی باکووردا تا ئێستا زمانی ستانداری نووسینیان بە هیچ زارێـك نییـە کتێب و رۆژنامەی پێ چاپ ناکرێ، ئـەوان بەرهـەمی ئـەدەبی و فیکریـان هـەر بەزمانی تورکی بڵاودەکەنەوە واتا ئەو نەوەی ئێستا بەدەگمەن دەتوانن بـەکوردی بنوسن و بخوێننەوە کوردەکانی باکوور نەك لە نووسین تەنانەت لە قسەکردنیـشدا زیاتر زمانی تورکی بەکاردێنن، تەنانەت ئەو کوردانـەی لـە ئـەوروپا دەژیـن لـە کاتی خۆنیشاندانەکاندا لافیتەو دروشمەکانیان بە تورکی دەنووسن و بـە تـورکیش بەرووی ئەورووپییەکاندا هاوار دەکەن.

بەهەرحاڵ لەلای ئەوان تا ئێستا قەدەغەیە بە کوردی بنووسرێ، جا هـەر زارێـك بێت، ئەمەش خاڵێکی ئیجابیە و قەبارەی کێشەکە بـچوکتر دەکاتـەوە، چـونکە ئەگەر ئەوان لە ئاستێکدا بوونایە کـە گەنجینەیـەکی گـەورەیان بـە زاری خۆیـان هەبایە و نەوەی ئێستایان هەموویان بەو زارە خوێندن و نووسینیان بکردایە، ئەوا نەدەتوانرا ئەم گەنجینەیە بسرێتەوە و راست و چەپی بەسەردا بهێنـرێ، یـان ئـەو نەوەیە، لێ رابهێنرێ کە واز لە زمانی خۆی بهێنێ و لە بیر خـۆی بباتـەوە و بـە زمانێکی تر بخوێنێ و بنوسێ. بۆیە دەتـوانرێ بەرنامـە دابنـرێ بـۆ ئـەوەی بـە شێوەی ناراستەوخۆ ئەو زمانـەی کـە لێـرەدا بـەکاردێ لـە کوردسـتانی بـاکوور بڵاوبکرێتەوە. هەمان دیاردە لە کوردستانی رۆژئاواش بەدیـدەکرێ. کوردسـتانی رۆژهەڵاتیش بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری و چاپ و چـاپەمەنی تێدایـە، بـەڵام بـەو رێژەیەیە نییە کە لێرەدا بەدی دەکرێ، دیسانەوە ئەگەر زاری کرمانجی ناوەراسـت کرا بە زمانی ستاندەر ئەوا لەلای کوردەکانی رۆژهەڵات هیچ کۆسـپێك دروسـت نابێ، چونکە ئەوانیش ئەو زارە بۆ نووسین بەکار دەهێنن.

لەرووی گەشەی سیاسی و دەسەڵاتەوە ئێمە گەلێك لە پێش بەشەكانی تردایین، بۆیە بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی بڕیار و بەرهەمی ئێمە كاریگەری لەسەر ئەوانی تر دەبێت.

لەلایەنی دەزگای چاپ و وەرگێڕان و میدیا و...هتد ئێرە باڵادەستە، دیسانەوە وەك خاڵی چوارەم ئەم باڵادەستیە كێشە كە لەلای ئەوانیش یەكلادەكاتەوە.

**كۆسپی سێیەم:**

وەك لە لاپەڕەی پێشوو روونم كردەوە دەشێ بۆ جێبەجێ كردنی ئەم پرسیارە سوود لە هەموو ئەو هۆكارانە وەربگیرێ، كە خزمەتی ئەو ستراتیژە دەكەن. بەتایبەتیش تەكنەلۆژیا و راگەیاندن، ئەمەشیان وەك زەمینە خۆشكردنێكیش بۆ بەشەكانی تری كوردستان، تاكو لە داهاتوویێكی نزیكدا زمانی ستاندەر لەلایان بڵاوبێتەوە، دەشێ بۆ بە پیرۆز گەیاندنی ئەم پڕۆژەیە سوود لەم خاڵانە وەربگیرێ:

١- تەلەفزیۆنەكان بە تایبەتیش كەناڵە ئاسمانییەكان، لەكاتی خوێندنەوەی هەواڵەكان دوو كەس دادەنێن، یەكێكیان كرمانجی ژووروو ئەوی تریان ناوەراست، یان هەندێ بەرنامە بەم زارە و هەندێكی تر بەو زار. ئەوان وای تێگەیشتوون كە ئەمە خزمەتە بۆ زمانی كوردی و نیشانەی دیموكراتیەت و بایەخدان بە هەموو زارێكە، نازانن چاڵێكە بۆ كوردی هەڵدەكەنن. ئێستا چوار تا پێنج كەناڵی ئاسمانی لە ژێر دەسەڵاتی كوردستانی باشوور دایە گەر بەرنامەكانی بە زمانێكی ستاندار پێشكەش بكا ئەوا كاریگەری دەبێ، تەنانەت رێژەیەكی یەكجار زۆر لە هاوڵاتیان لە رێگەی تەلەفزیۆن و میدیاكانەوە فێری زمانی عەرەبی بوون.

٢- دیسانەوە هەر لەرێگەی تەلەفزیۆنەوە دەبێ هەوڵی ئەوە بدرێ كە فیلمی بیانی و زنجیرەی بیانی بەو زمانە ستاندەرە دۆبلاژ بكرێ. ئەمەیان كاریگەرییەكی یەكجار گەورەی لەسەر ئافرەتان و ئەوانەی كە خوێندەوارنین هەیە. هەر بۆ نموونە زنجیرە بیانیەكانی وەك (گوادالوپێ، ماریمار، ساندرا...هتد) كە هەریەكەیان لە



١٠٠ ئەڵقە زیاتر بوو، جەماوەرێكی زۆریشیان هەبوو لەكاتی نمایش كردندا خەڵك هەمووی بە دیاریەوە دادەنیشتن، كەسێك ١٠٠ كاتژمێر گوێ لە فیلمێك بگرێ كە بەزمانی ستاندەر دۆبلاژكراوە بە دڵنیایەوە كاریگەری لەسەری دەبێ و فێری دەبێ. خۆ قوتابیەكی زانكۆش كە بەشی زمان تەواو دەكا هەر ١٠٠ سەعات گوێ بیستی زمانی بیانی دەبێ و لێی فێر دەبێ. نموونەیەكی زەقتری كاریگەری ئەم فیلمانە لەسەر فێربوونی زمان فیلمە میسریەكانە، ئافرەتانی ئێمە لە رێگای فیلمەكانەوە ئێستا وشەیەكی میسری نییە لێی تێنەگەن. خۆكەسیشیان لە قوتابخانە زاری میسرییان نەخوێندووە كەسیشیان وڵاتی میسریان نەدیووە. لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ بۆ بەرێگای تەلەفزیۆن و فیلمی تەلەفزیۆنی بتوانین فێری زمانێكی بیانی ببین، بەڵام نەتوانین فێری زمانی ستاندەری خۆمان ببین؟ هەر بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە دەزگای تایبەتی بۆ دۆبلاژكردن دابنرێ و لە ژێر چاودێری زمانەوان یان شارەزایانی زمانی كوردییەوە بێت.

٣- بایەخدان بە فیلمی كارتۆنی و دۆبلاژكردنیان بۆ زمانی ستاندەر، بەتایبەتیش لە بەرئەوەی مناڵ خێراتر فێری زمان دەبێت، وەك خاڵی دووەم.

٤- هەر لە لایەنی راگەیاندنەوە داوا لەو رادیۆ بیانیانە بە تایبەتیش دەنگی ئەمریكا بكرێ كاتێ بەرنامە بە زمانی كوردی پێشكەش دەكەن، ئەوا تەنیا بەزمانی ستاندەر پێشكەش بكەن، ئەمەشیان دیاردەیەكی ئاساییە. لەگەڵ ئەمانەشدا تەلەفزیۆنە ناوچەییەكان ئاساییە هەندێ بەرنامە و فیلم و شانۆگەری بەزارە ناوچەییەكان پێشكەش بكەن، بەڵام نەگاتە ئاستێك كە بەربەرەكانێی زمانی ستاندەر بكا.

٥- گرنگترین خاڵ دانان و دامەزراندنی كۆمپیوتەرە بە زمانی ستاندەری كوردی ئەمرۆ نەوەی نوێی ئێمە لە زمانی كوردی زیاتر نازانێ، زۆربەشیان كۆمپیوتەر بەكاردەهێنن. بە رێگای كۆمپیوتەرەوە فێری زۆر زاراوەی بواری

کۆمپیوتەر و هەندێ شتی دیاریکراویش بوون لە زمانی ئینگلیزی یان عەرەبی، ئەگەر بەرنامەی ویندۆز و ئۆفیس بە کوردی هەبێت. ئەوا لە دوو لاوە سوودی دەبێت: یەکەمیان بۆ چەسپاندنی زمانی ستاندەر، دووەمیشیان نەوەی نوێ زیاتر سوود لە کۆمپیوتەر دەبینێ، ئێستاش زۆر کەس لە کۆمپیوتەر نازانێ لەبەر ئەوەیە کە نەزمانی عەرەبی و نەزمانی ئینگلیزی نازانێ. کاتێ سەیری کۆمپیوتەر دەکەم بەزۆربەی زمانەکان بەرنامەی هەیەو دەشێ دابەزێنرێ تەنانەت زمانی وای تێدایە کە ژمارەی قسە پێکەرانی چوار یەکی ژمارەی کورد نابێ، کەچی هەموو شتێکیشیان هەیە. تەنیا ئێمەین لەم کاروانە بەجێماوین. تا ئێستا چەند بەرنامەی کۆمپیوتەری بەکوردی هەیە؟ بۆ منیش مافی ئەوەم نەبێ وەك گەلانی تر مۆبایلەکەم بە زمانی نەتەوەیی خۆم بەکار بهێنم. من کە دەمویست ئازادبم و زمانی خۆم بەکاربهێنم، ئایا هەر بۆ ئەوەم بوو، کە گۆرانی پێ بڵێم و هوتاف و دروشم بە کوردی بڵێم بژی فلان و بمری فلان؟ بۆ زمانی کوردی وەك زمانی هەموو گەلێکی تر لە پرۆگرامکردنی تەلەفزیۆن و مۆبایل و کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و تەنانەت لە کەتەلۆکی ئامێری کارەبایی و...هتد بەکارنەهێنم. خەڵك کە ئامێرێکی کارەبایی یان ئەلکترۆنی دەکڕی کەتەلۆکی بەزمانی ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی، تورکی...هتد لەگەڵدایە، تەنیا کوردی نەبێ. ئێمە وەکو دەوڵەتێك کە ئەو کەرەستانە دەکڕین بۆ لەسەر کۆمپانیاکان نەسەپێنین کە کەتەلۆکەکانتان دەبێ کوردیشی تێدابێ، ئەگەر نا لێتان ناکڕین. ئەم کۆمپانیانە بۆچی بۆ هەموو گەلێکی دروست دەکەن، تەنیا بۆ کورد نەبێ. ئایا عەرەبەکان خۆیان ویندۆز و ئۆفیس و بەرنامەکانی تری کۆمپیوتەر دروست دەکەن؟ بێگومان نەخێر. هەر کۆمپانیای مایکرۆسۆفتە بۆیان دروست دەکات. رەنگە بەنسبەت ئێمەشەوە پارەی بەقەد کۆنگرەیەکی جەواهیری یان دەعوەتکردنی ئیبراهیم تاتلسازێك تێنەچێ. بەڵام بۆ نایکەین؟ ئەم پرسیارە ئاراستەی دەسەڵات دەکرێت و وەڵامەکەی لای دەسەڵاتە؟ داوای وڵاتیش دەکەین



و بەخۆشمان دەڵێین پێشکەوتوو!! دەشڵێین ئێمە چیمان لە گەلانی تر کەمترە!؟ کە لە ساڵی ٢٠٠٦ یەك بەرنامەی کۆمپیوتەرمان نییە؟ یەك ئامێرمان نیە بەکوردی لەسەری نوسرابێ؟ خۆ وڵاتانی کەنداویش خۆیان ئەو ئامێرانەیان دروست نەکردووە، بەڵام ئەوان لە ترسی زالبوونی زمانی بێگانە لە ناویاندا هەموو شتەکانیان دەکەن بە عەرەبی زمان لەلای ئەوان نرخی دەزانرێ لە کاتێکدا وەکو کوردیش هەڕەشەیان لەسەر نییە.

بەباوەڕی من وەك چۆن لە رۆژگاری کۆندا بوونی کتێبی پیرۆزی ئایینی گرنگترین هۆکار بوو بۆ دروستبوونی زمانی یەکگرتوو، ئەمڕۆش قوتابخانە و میدیا و کۆمپیوتەر ئەم پۆستەیان وەرگرتووە و بە گرنگترین هۆکاریان دادەنێم. لە مێژوودا کتێبی پیرۆزمان هەبوو، بەڵام لە چوارچێوەیەکی زۆر بچووك و بێکەڵکدابوون، وەك مەسحەفی رەش و جیلوەو، سەرەنجامی یارسانەکان (ئەهلی هەق). کەچی سوویادن لێ نەبینرا و کاریگەرییان نەبوو، بەڵام با ئەمڕۆ ئەم هەلە بقۆزینەوە و ئەم کتێبە پیرۆزانە: کە قوتابخانە و میدیا و کۆمپیوتەرن بۆ ئامانجی نەتەوەیی بەکاربێنین.

## زەمینەی بابەتی ئەم پرۆژەیە

هەندێ لە زمانەوانەکان باوەڕیان وایە کە زمانی یەکگرتوو بە شێوەیەکی سروشتی لە ماوەیەکی دوور و درێژدا دروست دەبێ و پێویستی بە پلان و بەرنامە دارشتن نییە. ئەم بۆچوونە لە مێژوودا راست بوو ئەو کاتەی کە دەسەڵات نەبێت، تەنیا بەهۆی تێکەڵاوی و بازرگانی...هتد زارێك زاڵ دەبێ و دەبێ بەزمانی ستاندەر، بەڵام لەم سەردەمەدا بە پێچەوانەی دەبینم چونکە زمانیش وەك لایەنێکی گرنگی ئاسایشی نەتەوەیی دەسەڵات بەرنامەی بۆ دادەرێژی و بە پێی ئەو بەرنامەیەش گەشە دەکا، کۆمەڵێ نموونەی زیندوو لەبەر چاومانە کە دەسەڵات زمان بەو ئاراستەیەدا دەبا کە خۆی مەبەستیەتی، ئەوەتا کوردەکانی

تورکیا به پلانێکی دەوڵەتی تورکیا خەریکە زمانی خۆیان لەبیر دەکەن، یان ئەو بزووتنەوەیەی کە لە پەنجاکان لە میسر دروست بوو بۆ ئەوەی زاری میسری لە وڵاتی میسردا بکەن بە ستاندەر، بەڵام لەبەرئەوەی دەسەڵات دژی بوو لەناوی برد[1]، لە رۆژگاری ئەمڕۆدا سیاسەت هەموو بوارێکی کۆنترۆل کردووە، تەنانەت کاریگەری لەسەر خودی سروشتیشدا هەیە، ئیتر چۆن زمان لەم کاریگەرییە بەدوور دەبێ. تەنانەت ئێستاش کە بەرەو دوو ئاراستە دەڕوا بە هۆی گلۆپی سەوزی سیاسەتەوەیە. ئەگەر زمانی قسەکردنی رۆژانەی خەڵك نەچێتە ناو کایەی بەرنامە دانانەوە ئاساییە، بەڵام زمانی ستاندەر ناشێ بۆ سروشتی یان بە تەمای خوا بە جێ بهێلرێ، چونکە خۆی زمانێکی دەسکردە و سروشتی نییە، قسەپێکەری نییە، تەنیا لە بواری فەرمیدا بەکاردێت و خەڵك لە قوتابخانە فێری دەبێ، کەواتە چۆن دەزگا هەیە بۆ فێرکردنی، ئاواش دەبێ دەزگا هەبێ بۆ ئاراستەکردن و بژارکردن و یەکخستنی، هەموو ئەو وڵاتانەی کە زمانی یەکگرتوویان هەیە دەزگای تایبەتیان داناوە بۆ گەشەپێدان و پاراستنی ئەو زمانە. هەر بۆیە چاوەڕوان ناکرێ لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بەبێ بەرنامە دانان و بەشێوەی سروشتی زمانێکی یەکگرتوو بۆ کورد دروست ببێ، بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی ئێستا ئەم دوو زارەی کوردی بەرەو لێکجودابوونەوە دەچن. بۆیە پێویستە پەلە بکرێ لە بەرنامە دانان بۆ ئەم پڕۆژەیە. من وای دەبینم ئێستا زەمینەیەکی تارادەیەك لەبار هەیە بۆ کارکردن لەم پڕۆژەیەدا و بخرێتە زەمینەی واقیعەوە کۆمەڵێ هۆکاریش ئەم زەمینەیان رەخساندووە لەوانە:

١- زمانی کوردی لە چوار زاری سەرەکی پێکدێت، کرمانجی سەروو، کرمانجی ناوەراست، کرمانجی خواروو، هەورامی، هەردوو زاری کرمانجی ژووروو و کرمانجی ناوەراست بەرهەمیان پێ دەنوسرێ و بەرەو زاڵبوون دەچن، واتە کێشەکە لە نێوان دوو زار دایە، ئەوەی زەمینە خۆش دەکا بۆ سەرکەوتنی پڕۆژەکە

[1] فقه اللغة العربية، ١٩٨٧، ٣٦٠- ٣٧١.



ئەوەیە، کە هەردوو زار لە هەرێمی کوردستانی عێراق دا هەن و سەرچاوەی بەربەرەکانێی نێوان دوو زارەکەش تارادەیەکی زۆر لەم هەرێمەدایە. توانای بڕیاردان و توانای جێبەجێکردنی لەدەست کورد خۆیەتی و رێگری دەرەکی و نەبوونی دەسەڵات لەبەردەم بڕیارەکاندا نین. تەنانەت کوردستان بووە بە هەرێمێك کە سەرۆك و حکومەت و پەرلەمانی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەمەش جیاوازییەکی گرنگە لە نێوان ئێستاو رابردوودا. لە رابردوو بەرنامەدانان و دڵسۆزی بۆ کارەکە هەبوو، بەڵام دەسەڵات نەبوو. کەچی ئێستا دەسەڵات هەیە پێویستە بەرنامەی بۆ دابڕێژرێ. ئەگەر تا دوێنێ بیانوو ئەوە بووبێ کە شەڕی ناوخۆ و دابەشبوونی هەرێمی کوردستان رێگربووە بۆ بیرکردنەوە لەم پڕۆژە نەتەوەییە ئەوا ئەمڕۆ ئەم بیانووەش نەماوە.

٢- خوێندن لە هەرێمی کوردستان بە زمانی کوردییە بە بڕیارێکی وەزارەتی پەروەردە، دەشێ کتێبە مەنهەجیەکان یەکبخرێ و بە زمانێك بنوسرێ کە ئەمە بنەمای کارەکەیە.

٣- بەشی زۆری راگەیاندن و کەناڵە ئاسمانییەکان لەم هەرێمەدان و لەدەست کوردانن، دەتوانرێ بەرەو زمانی یەکگرتوو ئاراستە بکرێ. پێویستە دەسەڵاتی کوردی بەشێوەیەك کاربکا کە سوود لەم زەمینەیە وەربگرێ لەبەرئەوەی رۆژ بەرۆژ ئەم دوو زارە بابەتی زیاتریان پێ چاپ دەکرێ، رۆژنامە و گۆڤاری زیاتری پێ دەردەچێ و لەیەکتر دوور دەکەونەوە، رەنگە پاش چەند ساڵێکی تر جێبەجێکردنی بڕیارەکە لە ئێستا قورستر بێ، بەتایبەتیش کە هەستی قسەکەر بەرامبەر بەزارەکانیان پیرۆز تربوو لە زمانی یەکگرتوو، ئەوا کارەکە ئەگەر نەشگاتە ئەستەم، ئەوا زۆر قورس دەبێ. بۆیە ئەرکی سەرشانی دەسەڵاتی کوردییە، کە نەك هەر سوود لەم زەمینەیە وەربگرێ، بەڵکو پێویستە خۆی هەوڵبدا بۆ دروستکردنی زەمینە و زەمینە خۆش کردن بۆ جێبەجێکردنی ئەم پڕۆژەیە.

٤- خاڵێکی تری زۆر گرنگ کە وەك واقیعێك بەسەرماندا سەپاوە بـۆ ئـەوەی کار بۆ ئەم مەبەستە بکرێ ناچارمان دەکا هەنگاوی بەپەلەی بۆ بهاوێین ئەوەیـە، کە لە دەستوردا زمانی کوردیش وەك زمانی عەرەبی لە عێراقدا فەرمیـە. بـەڵام کام زمان؟. ئایا بیر لەوەکراوەتەوە؟ ئەگـەر وەزارەتـەکانی بەغـدا وەرگێـڕ دابـین بکەن لە نێوان کوردی و عەرەبی وەرگێڕ دەبێ بـۆ کامـە زاربـێ. خـۆ دەبـێ لـە دەرەوەی هەرێم و لە فەرمانگەو پەرلەمانی بەغدا و..هتد زمـانێکی یـەکگرتوو بەکاربهێنرێ. ئایا بەیانی تەلەفزیۆنە عێراقییـەکان وەك مجامەلەیـەك دەنگوبـاس یان چەند بەرنامەیەکی کوردییان پێشکەش کرد، بەکامە زار پێـشکەشی بکـەن؟ لەبەرئەوە دەسەڵاتی کوردی دەبێ بڕیاربداو زمانی ستاندەر دیار بکـاو لـە پێنـاو چەسپاندنیشیدا کاری بۆبکا.

## چۆنیەتی چەسپاندنی زمانی یەکگرتوو

نەبوونی زمانی یەکگرتوی کوردی هەمیشە گفتوگـۆی لەسـەرکراوە، هۆیەکـەش دراوەتـە پـاڵ نـەبوونی دەسـەڵات، رۆشـنبیرانی کـورد لـە چوارچـێوەی ئـەم گفتوگۆیانەی کە کردویانە هەندێك پێشنیارو پلانیان خستۆتە روو، لەوانە:

### یەکەم: تێکەڵکردنی دوو زار

ئەمرۆ لە کوردستاندا هەر دوو زاری کرمانجی سەرو، کرمانجی ناوەراسـت دوو زاری باڵادەستن بەرەو بەستاندەر بوون دەچن. ئیتر وایان بەپەسەند زانیووە کە بۆ ئەوەی مافی زارەکان بپارێزرێ و کەسـیان هەسـت بـە نـامۆیی نـەکا، وەك پرەنـسیبی تەوافق، وایان پێـشنیار کـردووە کـە ئـەم دوو زارە تێکـەڵ بکـرێ. یـەکێك لـە پێشەوایانی ئەم بۆچوونە د. جـەمال نەبـەزە کـە زۆر بـەوردی دیـاردەی زمـانی یەکگرتوو شیدەکاتەوە و باس لە جیاوازییە رێزمانییەکانی هەردوو زارکە دەکات و پێشناری تێکەڵکردنی هەندێ باری رێزمانی هەردوو زار دەکات، و لە کۆتـایی



کتێبەکەشیدا چـەند دەقێکـی بـەو زمانـە پێـشنیارکراوە نووسـیوە. ئەمـە لـە ناوەراستی حەفتاکاندا چاپکراوە. جگە لە د. جەمال نەبەز تارادەیك ئەم شـێوازە ستاندەرە لە نووسـینەکانی د. کوردسـتانی موکریانیـشدا بـەدی دەکـرێ، بـەڵام بەشێوەیەکی کاڵتر لەوەی کە د. جەمال دایڕشتبوو.

## هۆی سەرەنەکەوتنی ئەم رێگایە

د. جـەمال نەبـەز ئـەم رێگایـەی بـە چـاکترین رێگـا دانـابوو، بـەڵام نـەیتوانی سەرکەوتووبێ تەنانەت د. جەمال نەبەز خۆشی نەیتوانی ئەم رێگایە پەیڕەو بکـا و لەبەرهەمەکانی دواتری گەڕاوەتـەوە سـەر کرمـانجی ناوەراسـت. هـەروەها د. کوردستان موکریـانیش ئـەوەی لـە نووسـیەکانیدا تێبینـی دەکـرێ بـەم دواییـە گەڕاوەتەوە سەر کرمانجی ناوەراست و لەم رێگایە دوور کەوتۆتـەوە. کـەموکوڕی ئەم رێگایەو هۆی سەرنەکەوتنی دەتوانین لەم خاڵانەدا بخرێنە روو:

أ- زمان لە چەند ئاستێکدا خۆی دەنوێنێ لەوانە ئاستی دەنگسازی و ئاسـتی وشەسازی و ئاستی واتاسازی. لە ئاستی دەنگسازی جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئەم دوو زارەدا نییە. بەڵام لە ئاستی رێزمانەکە هەندێ جیـاوازی هەیـە. دەشـێ وشەکان تێکەڵ بکرێ فەرهەنگ لێکبدرێ. بەڵام ئەگەر هەوڵدرا رێزمـان تێکـەڵ بکرێ، ئەوا زمانێکی تر دروست دەبێ، کـە جیـاوازە لـە هـەردوو زار، ئەمـەش دەبێتە بارێکی قورستر بەسەر زمانەکەوە، زمانی ئوردوو نموونەی ئەم تێکەڵییەی نێوان دوو زمانی فارسی و هیندیە. ئێستا بۆتە زمانێکی سەربەخۆ کـە جیـاوازە لەگەڵ هەردوو زمانەکەی تر.

ب- تێکهەڵکێشکردنی رێزمان وەك تێکەڵکردن و بـەکارهێنانی وشـە نییـە. چـونکە رێزمـان بـەکرۆکی زمـان دادەنرێـت، ئاسـاییە ئەگـەر هـەر وشـەیەك بەکاربهێنرێ کارناکاتە سەر پێکهاتەی زمانەکە، نەك هـەر وشـەی زارێکـی تـر تەنانەت وشەی زمانێکی تریش بەکاربێت، ئاساییە. بـۆ نموونـە زمـانی فارسـی

ڕێژەیەکی یەکجار زۆری وشەی زمانی عەرەبی تێدایە، بەڵام لەبەرئەوەی ڕێزمانێکی فارسی هەیە هیچ گرفتی دروست نەکردووە. زۆربەی وشە عەرەبییەکان چونەتە ناو زمان فارسی، بەڵام کەسێکی فارس ئەگەر دەقێکی عەرەبی بخوێنێتەوە، لێی تێناگات لەبەرئەوەی ڕێزمانەکەی نازانێت. یان دەشێ نموونەیەکی تر بهێنەوە، قوتابیانی ئێمە سەدان وشەی زمانی ئینگلیزیان لەبەر کردووە و دەزانن واتای چیە. بەڵام ناتوانن بە زمانی ئینگلیزی قسە بکەن لە کاتێکدا بۆ قسەکردنی ڕۆژانە پێویستیی بە ڕێژەیەکی کەمتر لەو وشانە دەبێت، کە لەبەریەتی و هۆی نەزانینی زمان ئەوەیە کە قوتابیانی ئێمە فێری بەکارهێنانی ڕێزمانەکە نەبوون، ئیتر بۆیە ڕێزمان بە کرۆك دادەنرێت و دەسکاری کردن و تێکەڵکردنی دەبێتە هۆی دروستبوونی زمانی سێیەم.

**دووەم: چەسپاندنی کرمانجی ناوەڕاست**

زۆر لە ڕۆشنبیران پێیان وایە، کە زاری کرمانجی ناوەڕاست بکرێتە زمانی ستاندەر ئەوانیش ئەم هۆیانە دەکەن بە پاڵپشتی بۆچونەکانیان.

١- لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە ئەم زمانە پێی دەنوسرێ و پێی دەخوێندرێتەوە، تەنانەت ڕۆشنبیرانی زارەکانی تریش بەرهەمی نووسینیان بەم زارە هەیەو بەکاریان هێناوە، واتە بۆتە زمانێك کە جگە لە ئاخێوەرانی کوردی ناوەڕاست، هەورامی و کرمانجی ژووروو و لور هتد بەکاریدەهێنن ئیتر کە بۆتە ستاندەرێك با زیاتر بایەخی پێبدرێ.

٢- هەموو ئەو حکومەت و شۆڕشە کوردییانەی کە لە سەدەی بیستەم دروستبوون ئەم زارەیان کردووە بە زمانی ستاندەری خۆیان، بۆ نموونە کۆماری مەهاباد کە قازی نەمر ڕێبەرایەتی کرد، حکوومەتی شێخ مەحمودی نەمر، بارزانی نەمرو شۆڕشی ئەیلول... هتد، ئەمانە دانیان بە زاری کرمانجی ناوەڕاستدا ناوەو کردوویانە بە زمانی ستاندەر.



٣- ئێستاش لە پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەیانە ڕەسمییەکان هەر بەو زارەیە بە ستاندەر دادەنرێ،، ئیتر کە ئەم ستاندەرە بنکەیەکی دروست کردووە بۆچی لە جیاتی گەشەپێدان تێکبدرێ.

٤- زۆری بڵاوکراوە و گۆڤار و کتێب بەو زارە و کەمی بە زاری کرمانجی ژووروو، بۆ نموونە کتێبە چاپکراوەکانی بە زمانی کوردی لە ساڵی ١٩٢٠ تاکو ساڵی ١٩٨٥ بەم شێوەیەیە[1]:

| بابەت | کرمانجی ناوەڕاست | کرمانجی ژووروو | هی تر | ژمارەی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| کتێب | ١٠٨١ | ٢٦ | ٨ | ١١١٥ |

خشتەی ژمارەی چاپکردنی کتێب بە زارەکانلە ١٩٢٠ تا ١٩٨٠




ئاماری چاپی کتێبەکان لە ١٩٢٠ تا ١٩٨٠

[1] لەم ئامارە سود لە م سەرچاوەیە وەرگیراوە: Jukil Ali Mahmood, The process of Standardization with reference to English and Kurdish, ٢٠٠٤

٥- له زانکۆشدا بەشی زمانی کوردی زاری کرمانجی ناوەراست وەك زمانی ستاندەر دەخوێندرێ و لێکدەدرێتەوە...هتد.

**سێیەم: دوو زمانی ستاندەر:**

هەندێك لە زامانەوان و رۆشەنبیرە کوردەکان لەم قۆناغەدا بە پەسەندی دەزانن کە دوو زمانی ستاندەر بۆ کورد هەبێ، وەك ئەوەی کە ئێستا هەیە بە بارێکی سروشتی دادەنێت، بەڵگە و پاڵپشت بۆ بۆچوونەکانیان دەشێ بەم جۆرە بخەینەڕوو.

١- بەلایانەوە ئاساییە گەر دوو زمان لە وڵاتێکدا هەبێ، نموونەی وڵاتی سوید کە سێ زمانی ستاندەری تێدا بەکاردێ یان کەنەدا کە دوو زمانی ستاندەر و فەرمی هەیە ئەوانیش ئینگلیزی و فەرەنسیین. وای دەبینن کە ئاساییە ئەگەر لەناو نەتەوەی کوردیشدا دوو زمانی ستاندەر هەبێ، ئەزموونی ئەم وڵاتانە لە فرە زمانی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. لەم قۆناغەدا لەبەرئەوەی دەسەڵاتێکی سیاسی سەرتاپایی لەناو کوردا نییە، لەلایەکی تریشەوە باری دەروونی و کۆمەلایەتی تاکی کورد لەم قۆناغەدا لەبارنییە بۆ سەپاندنی یەك زمان و بەزۆر سەپاندنی، سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ، هەر بۆیە بە پەسەندی دەبینن کە دوو ستاندەر بۆ کورد دروست ببێ. بەباوەڕی من دوو ستاندەری کاریگەری سلبی نەتەوەیی زۆر دەبێ لەسەر نەتەوەی کورد بە تایبەتی لەبەرئەوەی کورد یەك کولتورو مێژوو و چارەنووسی هەیە و وەك ئەو گەلانە نییە کە کولتوری جیاوازیان هەیە. نەك بۆ کورد، چونکە کورد کە کولتورێکی هاوبەشی هەیە ئەگەر دوو زمانی ستاندەری بۆ دروست بوو، ئەوا لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی دابەشبوون و لێك جیابوونەوەی کولتورەکەش، جگە لەمەی کە بەرهەمی بیر و توانا و داهێنان...هتد دابەش دەبێ، لە ئەنجامیشدا وەك نەتەوە دابەش دەبێ و دەبێتە دوو نەتەوەی سەر بەیەك خێزان. وەك ئێستای کورد و فارس کە بوونەتە دوو نەتەوەی خزم.



٢- هەندێکی تر باوەڕبوونیان بە دیموکراتی و مافی تاك بە مافێکی ئاسایی دادەنێن کە دوو زمانی ستاندەر هەبێ، رەنگە هەندێ بۆچوونی توندڕەوانەش هەبێ و بڵێن ئێمە خەونمان بە ئازادیەوە دەبینی ئێستا کە ئازاد بووین بۆ بەزمانی خۆمان نەخوێنین، بەو ئومێدە شۆڕشمان کردووەو راپەڕین کە زمانی بێگانەمان لە کۆڵ بێتەوە و منالاَنمان بە عەرەبی نەخوێنن، ئێستا بە دیالێکتی خۆمان نەخوێنین و دیالێکتێکی تر بێ جیاوازی چیە بۆ ئێمە، رەنگە هەندێکیان لەوەش توندڕەوانە تر بڵێن خۆزگە بە عەرەبییەکە و لە دیالێکتەکەی تر باشتر بوو. جگە لەمەش بەڵگەی تر دەهێننەوە کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا منالاَن لە قۆناغی سەرەتایی بە دیالێکتی خۆیان دەخوێنن، لە هەندێ وڵاتی تردا تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی دایکیان دەخوێنن، لێرەدا لەبەر ئەوەی مەبەست لە خوێندن لەم قۆناغە سەرەتاییەدا بەمەبەستی فێربوونی خوێندنە بۆیە چاکترین و ئاسانترین رێگا بەکاردێنین، بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی توانای منالّ دیاریکراوە، بۆیە لە سەرەتادا ئەوان نایانەوێ فێری زمانی بکەن، بەڵکو مەبەستیان فێربوونی خوێندنە، بەڵام لە قۆناغەکانی دواتر دەبێتەوە بە زمانی ستاندەر.

ئەم بۆچوونەش رەنگە لە روانگەیەکەوە راست بێ، بەڵام ئەو کات ئەگەر وابێ، ئەوا نابێ داوای دوو ستاندەری بکرێ، بەڵکو دەبێ ببێتە کۆمەڵێ ستاندەر. دەبێ ئەو مافە جگە لە بادینی و سۆرانی بدرێ بە هەورامی و گەرمیانی و لوڕ و خۆشناوەتی و...هتد.

زمانی یەکگرتووی کوردی بە رادەیەك بۆ کورد و پاراستنی نەتەوەیی کورد پێویستە، کە بەرژەوەندی باڵای نەتەویی ئەوە دەخوازێ هەندێ زاری لە پێناودا فەرامۆش بکرێ،

٣- هەندێکی تر پێیان وایە کە زمانی ستاندەر پێویستی بە زەمینە خۆشکردن و بەهێز بوونی هەستی نەتەویی هەیە و گرنگی و بایەخی زمانی

یەکگرتوو لەلای قسەکەران دیالێکتە کە روون بێتەوە و گرنگی زمانی یەکگرتوو زیاتر بێ لەلای ئەندامان لە زاری خۆیان. تا ئێستاش ئەم زەمینەیە لەناو گەلی کورددا نەرەخساوە، بۆیە وای دەبینین ئەگەر دیالێکتێك کرا بە زمانی ستاندەر ئەو قسە پێکەرانەی دیالێکتەکانی تر بە ئاسانی لەرووی دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە وەری ناگرن. تەنانەت توشی نامۆبوون و هەست کردن بە کەمی دەکەن، نمونەی ئەوەش دانیشتوانی شاری دهۆك لە پێش راپەڕین، قوتابخانە عەرەبیەکانیان پێ چاکتربوو لەوەی کە لە قوتابخانە کوردیەکاندا بە کرمانجی ناوەراست بخوێنن، هەر بۆیەش دەبینین رێژەی قوتابخانەی عەرەبی لە دەڤەری بادینان گەلێ زۆر بوو، رێژەی ئەو قوتابخانانەی کە بەکوردی تیایاندا دەخوێندرا دەگمەن بوو.

من وای دەبینم کە کەمی رێژەی خوێندن بە کوردی لە دەڤەری بادینان لە پێش راپەڕین تەنیا بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە دانیشتوانی ئەم دەڤەرە هەستیان بە نامۆیی کردبێ بەرامبەر بە کرمانجی ناوەراست و بۆیە زمانی عەرەبیان لەسەرووی زمانی کوردی داناوە. بەڵکو هۆکاری جوگرافی و کۆمەڵایەتی تر کاریگەرییان هەبووە لەسەر ئەوەی کە دانیشتوانی ئەم دەڤەرە ئەم هەڵوێستە وەربگرن لەوانە:

أ- ئاساییە زمانی دەوڵەت و زمانی زۆرینە لە عێراقدا زمانی عەرەبی بوو. فێربوونی زمانی عەرەبی هەلی کار و خۆگونجاندنی زیاتر دەرەخساند. دایك و باوك هەمیشە بەتەنگ ئەوەوەن کە دوا رۆژی چاکتر بۆ منداڵەکانیان دابین بکەن، ئیتر لەم روانگەیەوە بە پەسندیان دەزانی، کە منالانیان فێری زمانی عەرەبی بکەن، هەر وەکو ئەو دایك و باوکانەی کە کۆچ دەکەن بۆ ئەمریکا ئەگەر لە ناوچەیەکی ئەمریکادا بژین، کە زمانی ئیسپانی تێدا بخوێندرێ، ئەوا حەز ناکەن و بەرەنگاری ئەوە دەبنەوە کە منالەکانیان لە قوتابخانەی ئیسپانی بخوێنێ و



هەوڵدەدەن منالەکانیان لە قوتابخانەیەکی ئینگلیزی بخوێنێ، چونکە زمانی ئینگلیزی زمانی هەموو ئەمریکایە. ئەم باوکانە وای دەبینن کە نەزانینی زمانی ئینگلیزی هەڕەشە لە پاشەرۆژی منالەکانیان دەکا. تەنانەت ئەگەر دایك و باوکەکە خۆشیان ئیسپانی زان بن و قسەکەرێکی زمانی ئیسپانی بن. وای بە چاکتر دادەنێن کە زمانی دووەم فێربێ کە ئەویش زمانی ئینگلیزییە چاکترە لە زمانی ئیسپانیەکە، وای دەبینێ فێربوون یان خوێندنی ئیسپانی منالەکانیان لە کۆمەڵگای ئەمریکی دادەبڕێ.

ب- هۆکارێکی گرنگی تری ئەم دیاردەیە لەدەڤەری بادینان هۆکاری جوگرافی بوو، کە لە شاری موسڵ نزیکتربوو، ئەمەش وایکردبوو، کە تێکەڵی خەڵکی شاری دهۆك لەگەڵ شاری موسڵ (کەزمانی عەرەبی تێدا بەکار دێ) زیاتر بێ، ئەگەر بەراورد بکرێ لە تێکەڵی دانیشتوانی دهۆك و هەولێر و دەڤەرەکانی تری کوردستان کە زمانی کوردی ناوەراستی تێدا بەکاردێت. تەنانەت حکومەتی ئەو کاتیش رێگای هاتووچۆی لە نێوان دهۆك و موسڵ، ئاکرێ و موسڵ دروست کردبوو، بەڵام ئەم رێگا بازرگانیانە لە نێوان دەڤەری بادینان و سۆران بەم شێوەیە نەبوو، ئەمانە وایکردبوو، کە خەڵکی دەڤەری بادینان زیاتر لەگەڵ شاری موسڵ پەیوەندی ببەستن، بۆیە ئەم کارە کاردانەوە سروشتیەکەی ئەوە دەبێ کە منالانیان بنێرنە قوتابخانەی عەرەبی.

### کەموکوڕیەکانی دوو ستاندەری:

وەکو باسمان کرد بەکارهێنانی دوو زمانی زیاتر بۆ ئەو دەوڵەتانە لەبارە کە دوو نەتەوی جیاوازیان هەبێ، ئەمەش وەك ناچاری پەنا بۆ ئەم دۆخە دەبەن، ئەگینا دوو زمانی کۆمەڵێ سلبیاتی هەیە، بەتایبەتیش بۆ نەتەوەی کورد کە یەك

نەتەوەییەوە یەك كولتووری هاوبەشی هەیە، دوو ستاندری زیانی ستراتیجی نەتەوەیی هەیە. جگە لەمەش كە رەنگە لەداهاتوودا بیكات بە دوو نەتەوە بۆ ئەم قۆناغەش كۆمەڵێ گرفتی هەیە لەوانە:

**یەكەم:** ئەگەر حكومەتی هەرێمی كوردستان بە فەرمی دان بە دووستاندەر دابنێ، ئەوا پێش ئەوەی رێگا بدا ستاندەری دووەم لە وڵاتدا بخوێندرێ، دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە.

١- ئایا دوو ستاندەری چ كاریگەرییەكی لەسەر یەكێتی نەتەوەیی هەیە؟
٢- دوو ستاندەری زەمینە خۆش ناكات بۆ ئەوەی لە دوارۆژ داوای جیابوونەوە یان دابەشبوون رووبدات؟.
٣- تا چ رادەیەك دڵنیایە لەوەی كە دووستاندەری نابێتە هۆی ئەوەی كە داوای زیاتر لە خۆبەرێوەبردن و داننان بە پێناسەی تایبەتی و ئابووری تایبەتی..هتد لەلایەن زمانەكانەوە سەرهەڵبدا یان سنوور نابەزێنن؟
٤- ئایا دوو ستاندەری تا چ رادەیەك گیروگرفتی ئیداری لێ دەكەوێتەوە، ئایا بەرنامەی چیە بۆ چارەسەركردنی گرفتە ئیدارییەكان؟
٥- ئایا بوونی دوو ستاندەری هەڕەشە لە یەكێتی رۆشنبیری وڵات دەكات یان نا؟
٦- ئایا دوو ستاندەری هەڕەشە لە پابەندبوونی سیاسی و وەڵامی زمانەكان بۆ وڵات و زمانەكەی تر دەكات یان نا؟
٧- ئایا بۆ دانانی پرۆگرام و كتێب و قوتابخانەكان و رۆژنامە بەدوو ستاندەر لە رووی ئابوورییەوە، تاچ رادەیەك بارگرانی بۆ دەوڵەت دروست دەكا.
٨- ئایا خوێندنی دەبێتە ئارەزوو لە هەموو ناوچەیەك، یان لە هەموو قوتابخانەیەك هەردوو زمان دەخوێندرێ یان هەر قوتابخانەیەك یەك زمانی تێدا دەخوێندرێ دیاری دەكا؟ یان قوتابی ئارەزووی خۆیەتی هەر زمانێك بخوێنێ؟



٩- رێژەی چڕی دانیشتوان و دابەشبوونی جوگرافیای لە ستاندەرەكە تا چ رادەیەك یارمەتی ئەوە دەدات. بۆ نموونە ئەو خەڵكانەی كە بەزمانی (١) قسەدەكەن و دانیشتوی شوێنێكن كە زمانی (٢) تێدا زۆرترە.
١٠- ئایا دەوڵەت بیری لەوە كردۆتەوە، كە خوێندن بە دوو زمان تەنیا بابەتی زمانی كوردی ناگرێتەوە، بەڵكو پێویستە سەرلەنوێ هەموو كتێبە مەنهەجیەكان وەك فیزیا، كیمیا، مێژوو، ماتماتیك، جوگرافیا، ئەندازە، ئابووری، بە دوو زمان دابرێژرێتەوە؟
١١- لەبارەی كەمە نەتەوەییەكانی تر دەوڵەت چ بەرنامەیەكی هەیە؟ ئەگەر ئەوانیش داوایان كرد، وەڵامی چی دەبێ؟
١٢- ئایا دوو زمانی گرفتەكانی كۆمەڵگای كوردی لە رووی سیاسی و ئیداری و خوێندنەوە، چارەسەر دەكات یان گەورەتری دەكات، كە لە داهاتوودا چارەكردنی زەحمەتتر دەبێ؟
١٣- دەسكەوتەكانی دوو ستاندەری چین؟ قوربانی و هەوڵدانەكان چین؟ لەرووی هاوكێشەی سوود و قازانج ئایا كامیان زیاترە دەسكەوت یان زیان ؟...هتد

**دووەم:** ئەگەر دانمان بەوەدانا كە لە دوارۆژدا كورد دەبێ یەك زمانی ستاندەر بەكاربێنێ، بەڵام لەم قۆناغەدا ناكرێ و بەوە پاساو بدەینەوە كە ئێستا بارودۆخ لەبارنییە. ئەوا دەبێ دان بەوە دابنێین كە چەندی زووتر هەوڵ بۆ یەك ستاندەری بدرێ چاكترە، چونكە رۆژ بەرۆژ ئەم بارە ئاڵۆزتر دەبێ، تا دەگاتە قۆناغێك كە بەتەواوی لێكدادەبڕێن تەنانەت قسەكەران لەدوای دە تا بیست ساڵی تر كە بەزمانی خۆیان خوێندوویانە و نەوەیەكی نوێ دروست بووە، كە بەزمانی (أ) گۆشكراوە، ئەو كات زۆر گرانە تۆ ئەو هەستەی لەلا دروست بكەی لە رووی دەروونی و كۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، كە ببنەوە بەیەك زمان، رۆشنبیرو حكومەتی ئەو كات گلەییەكەی دەخاتە سەر شانی بەرپرسانی ئێستا و مێژووش گلەیی لێ دەكا كە لە قۆناغێكدا چارەسەركردنی ئاسان بووە و نەمان كردووە.

**سێیەم:** قوتابی ئەگەر تا ئامادەیی تەواو دەکا لە شاری خۆی و بەزمانی دایکی بخوێنێ، کە هاتە زانکۆ تووشی چ گرفتێکی گەورە دەبێ لە رووی زانستیەوە چەند دواکەوتوو دەبێ، چونکە زمانەکەی نازانێ، ئیتر ناشکرێ بەرنامە دابنرێ بۆ ئەوەی لە زانکۆش هەرکەس لە شاری خۆی بخوێنێ و بەزمانی خۆی بخوێنێ تەنانەت کە زانکۆشی تەواو کرد، ئەوا ناشێ لە شوێنێکی تر نەبێتە کاربەدەست یان فەرمانبەر... هتد. خۆ ئەگەر بەم شێوەیە بوو، ئەوا دابڕانێکی تەواو لە نێوان زارەکاندا دروست دەبێ و هەر ئەوەش وایکردووە کە باوەڕ بەوە بێنم لەئەنجامدا دوو هەست و کولتوور و رۆشنبیری جیاوازیش دروست دەبێ، سەرنجام دوو نەتەوەی جیاوازی لێ دەکەوێتەوە.

## بەشی سێیەم (زمان و زار)

### جیاوازی نێوان زمان و زار

زمانەوانی کۆمەڵایەتی پشت بە سێ بنەما دەبەستێ بۆ جیاکردنەوەی زمان و زار کە بریتین لە[1]:

### بنەمای لەیەکتر گەیشتن:

ئەگەر دوو زار لە یەکتر گەیشتن، ئەوا ئەم دوو زارە زمانێك پێکدێنن، بەڵام ئەگەر لەیەکتری نەگەیشتن، ئەوا هەر یەك لەمانە دەبن بە زمانی سەربەخۆ، بۆ نموونە: زاری (أ) و زاری (ب) بە پێی ئەم بنەمایە ئەگەر قسەکەرانی (ا) لە قسەکەرانی زاری (ب) گەیشتن و بە پێچەوانەشەوە ئەگەر قسەکەرانی زاری (ب) لە قسەکەرانی زاری (أ) گەیشتن، ئەوا (أ) و (ب) بە دوو زار دادەنرێن و بەیەکەوە زمانێك دروست دەکەن. ئەگەر (أ) کرمانجی ژووروو بێت، و (ب) کرمانجی ناوەراست، ئەوا ئەگەر ئەم دوو زارە لەیەکتر گەیشتن ئەوا زمانێك دروست دەکەن، بەڵام ئەگەر لە یەکتر نەکەیشتن ئەوا هەر یەکەیان دەبن بە زمانی سەربەخۆ.

### بنەمای قەبارە

هەموومان وا لە زمان دەگەین، کە گەورەترە لە زار واتە ناوچەیەکی فراوانتری داگیر کردووە، ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ زاردا. بۆ نموونە ئەگەر سەیری نەخشەی کوردستان بکەین، ئەوا زمانی کوردی سەرتاپای نەخشەکە دادەپۆشێ، بەڵام هەرزارێك دیاری بکەین، تەنیا ناوچەیەکی بچوك دەگرێتەوە.

[1] د. محەمەد مەعروف فەتاح، محازەرەیەکی خوێندنی باڵا، ٢٠٠٠.



### بنەمای ناوداری

بە باوەری زمانەوانی کۆمەڵایەتی تەنیا یەك جیاوازی هەیە لە نێوان زمان و زار ئەویش ئەوەیە زمان ناودارترە. هیچ خەوش و لەکەیەکی پێوە نییە واتە کەس گلەیی لێ ناکا. بەڵام زاری ناوچەیی لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بە چاوێکی تر سەیر دەکرێ. بە تایبەتی کە کەسێك دەچێتە ناوچەیەکی تر، ئەگەر بە زمان قسە بکا (زمانی ستاندەر) بە ئاسایی دادەنرێ، بەڵام ئەگەر بە (زار) قسە بکا ئەوا بە ئاسایی دانانرێ.

### کەمو کورییەکانی بنەمای لەیەکتر گەیشتن

زۆر جار ئەو گلەییە دەکرێ کە زارە کوردییەکان لە یەکتری ناگەن، یان قسەکەرانی زاری(أ) دەتوانن لە قسەکەرانی زاری (ب) بگەن، کەچی قسەکەرانی (ب) ناتوانن لە زاری (أ) بگەن. لە راستیدا بنەمای لەیەکتر گەیشتن چەند کەموکورییەکی هەیە لە خوارەوەدا دەیان خەینەڕوو:

١- جیاوازی لە نێوان زارەکاندا نییە، بەڵکو جیاوازی لە نێوان قسەکەراندایە، چونکە لە رووی هەستەوە دەردەکەوێت یان بە هۆی حەز و ئارەزووەوە دەبێ. بۆ نموونە: ئەگەر کوردی ناوەڕاست لەگەڵ ناوچەی هەورامی بەراورد بکەین، زاری هەورامی لە هیچ رووێکەوە بە کوردی ناوەراست ناچێ. بەڵام کە لە کوردێکی هەورامی دەپرسی لە کوردی ناوەراست تێدەگەی؟ دەڵێ: بەڵێ یان بە پێچەوانەوە. کوردی ناوەراست دەڵێ لە هەورامی تێدەگەم. ئەمە لە رووی هەستی نەتەوەییەوەیە. واتا هەستی نەتەوەیی وادەکا کە زارەکان بە زار دابنرێن و بەیەکەوە یەك زمان پێکبهێنن. چونکە لە بەرژەوەندی هەردوولادایە (لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە) کە بڵێن ئێمە کوردین. بەم پێیە لە تێگەیشتن دەرچوو بوو بە بەرژەوەندی.

لێرەدا بەرەو رووی دیاردەیەکی سەیر دەبینەوە،نموونەی دوو شێوەزاری هەورامی (لهۆن) و (تەخت). ئەوەی کە لە عێراقە (هەورامی لهۆن) دەڵێ من کوردم و

زمانم کوردییە. ئەمەش لەبەر هەستی نەتەوایەتییە. بەرژەوەندی بۆ پەیداکردنی ناسنامەی سیاسی ئەم هەستەی دروست کردووە. بەڵام بەشەکەی تری هەورامی (هەورامی تەخت) کە کەوتۆتە ئێران زۆریان وای دادەنێن کە هەورامی سەر بە زمانی فارسییە. ئەمەش لەسەر بنەمای سیاسییە، چونکە بەرژەوەندییەکەی وا دەخوازێ.

٢- پەیوەندی لە یەکتر گەیشتن پەیوەندییەکە لە نێوان خەڵکەکەدایە، نەك لە نێوان دوو شێوەی زمانەکە. چونکە خەڵکەکەن لەیەکتری دەگەن نەك زارەکان، خەڵکەکەیە قسە بە زارەکە دەکەن، کەواتە پلەی لەیەکتر گەیشتن بەند نییە بە پلەی لێکچوونی دوو زارەکە.

٣- بنەماکە زۆر جار لەگەڵ تێروانینی خەڵکەکەدا ناگونجێ. بۆ نموونە: ئەم دوو زارە (أ) و (ب) زمانێکن یان ئەم دوو زارە (أ) و (ب) دوو زمانی جیاوازن. لە رووی زانستیەوە ئەم بنەمایە سەرکەوتوو نییە، چونکە پەیوەندی بە زارەکانەوە نییە، بۆ ئەمە دوو نموونە دەخەینە روو. ئەو شێوانەی کە بە دوو زمان دادەنرێن لە رووی مێژووییەوە یەك زمان بوون. بۆ نموونە سویدی و نەرویجی، بەڵام ئێستا هەر یەك لە وڵاتێکدا بەکار دێ و تێروانیینی قسەپێکەرانی لەگەڵ یەکتر جیاوازە، لە بەر ئەوەی سنووری سیاسی جیای کردونەتەوە بۆیە بە دوو زمان سەیر دەکرێ کەچی لە رووی مێژووییەوە یەك زمانن. یان زمانی هیندی و ئۆردوو، زمانی ئۆردوو لە پاکستان بەکاردێ و رێنوسی عەرەبی هەیە. هیندیش لە هیندستان بەکاردێ بە رێنوسی هیندی کۆن دەنووسن. ئەم دوو زمانە (هیندی و ئۆردوو وشەکانیان هاوبەشە و لە رووی رێزمانییەوە زۆر لەیەك نزیکن، کەچی بە دووزمان دادەنرێن. جیاوازی ئەم دوو زمانە تەنیا لەبەر سنووری سیاسی نییە، بەڵکو لەبەر سنووری توندڕەوی ئاینییە. هەردوکیان دەڵێن ئێمە لە یەکتری ناگەین. هەرچەندە لە رووی مێژوویی و رێزمان و تەنانەت لە رووی گەشەیانەوە جیاوازیەکی ئەوتۆیان نییە، تەنیا رێنوسیان جیاوازە. هەمان گرفت لە نێوان



سرب و کرواتیەکەندا هەیە، کە تاماوەیەك پێش ئێستا خاوەنی یەك سنوری سیاسیان بوون کە ئەویش وڵاتی یوگسلافیا بوو. ئەمانە نەك لە رووی سیاسی و نەتەوەیی و ئایین جیاواز نین، تەنانەت مێژوشیان یەکە تەنیا جیاوازی نێوانیان لە (مەزهەب) کەیاندایە. کرواتیەکان (کاسۆلیك)ن و سربەکانیش (ئەرسۆدۆکس)ن. ئەمە وای لێکردون بڵێن لە یەکتری تێناگەین.

٤- ئەو شێوانەی کە خەڵك بە (زار)یان دادەنێ هەندێ جار دوو زمانی سەربەخۆی جیاوازن، وەکو (ماندلێنی) و (کاتنۆنی)، لە راستیدا قسەکەرانی ئەم ئەم شێوانە لە یەکتری تێناگەن، کە پێویستە بگوترێ دوو زمانی جیاوازن. بەڵام ئەگەر پرسیار لە قسەکەرانی ئەم دوو زارە بکرێ، دەڵێن لە یەکتر دەگەین. ئەوەی بۆتە هۆی یەکبوونی ئەم شێوانە ئەوەیە، کە بە یەك رێنوس دەنووسن، ئەویش رێنوسی وێنەییە. واتە رێنوسەکە کۆی کردوونەتەوە، بۆتە هۆی لەیەکتر گەیشتن. وادەزانن ئەو وڵاتە (چین) یەك زمانی هەیە، ئەویش زمانی چینی یە. باشترین نموونە لای خۆمان عەرەبەکانن. زۆر لە زارە عەرەبییەکان لە یەکتر ناگەن، بۆ نموونە جەزائیریەك لە عێراقی یان مەغریبیەك لە سعوودی ناگات. بەڵام عەرەبەکان زمانی قورئان کۆی کردونەتەوە. نەك وێنەی نووسینەکە. عەرەبەکان ناڵێن لە زاری یەکتر تێناگەین. چونکە چوارچێوەی سیاسی و هەستی نەتەوەیی کۆی کردونەتەوە. جگە لەوەش هەموویان زمانی عەرەبی (فصحى) یان هەیە. بۆ نموونە ئەگەر جەزائیریەك لە سعودییەك نەگەیشت ئەوا بە زمانی (فصحى) قسە دەکەن. بە (فصحى) کەش لە یەکتری دەگەن چونکە هەر لە ساڵانی یەکەمەوە لە قوتابخانە فێری دەبن.

٥- لەیەکتر گەیشتن پەیوەندی بە شارەزایی قسەکەرانی دوو شێوەکەوە هەیە. ئەم شارەزاییە مەرج نییە لە لای هەمو قسەکەران وەك یەك بێ. لەبەر ئەوە مەرج نییە قسەکەران بە دوو زارەکە یەك بیرو بۆچونیان هەبێ بەرامبەر بە تێگەیشتن.

لەبەر ئەم خاڵانەی سەرەوە بنەمای لە یەکتر گەیشتن بڕیار لە دەست زانست وەردەگرێتەوە و دەیداتە دەست خەڵك، ئەمەش پابەند دەبێت، بە هەست و سۆز و ئارەزوو و بەرژەوەندی قسەکەرانەوە نەك بڕی لێکچوون و جیاوازی نێوان نێوان دوو زارەکە.

## کەموکوڕییەکانی بنەمای قەبارە

بنەمای قەبارە زۆر لەگەڵ واقیعی زارو زمانەکەدا ناگونجێ. چونکە زۆر جار رووبەری زار لە زمان گەورەترە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لەم نەخشەیەدا: با وا دابنێین (أ) و(ب) (ج) (د) چوار زارن و رووبەری نەخشەیەکی لەم شێوەیە داگیر دەکەن.




ئەگەر رووبەری زارەکان لابەرین هیچ پانتاییەك بۆ زمان نامێنێتەوە.

بەم پێیە دێینە سەر رایەکەی (ماسیۆ) کە دەڵێ (جیاوازیەکی راست لە نێوان زمان و زاردا نییە تەنیا لە رووی ناودارییەوە نەبێ).



## بایەخدان بە زمان یان زار

دیاردەیەکی ئاساییە کە هەر زمانێك چەند زارێکی هەبێ، هیچ حکومەتێکیش بەرنامەی وای دانەڕشتووە کە بایەخ بە هەموو زارەکان بدات و بەیەك چاو سەیریان بکات، هەموو ئەو زمانانەی کە شێوازی ستانداردیان هەیە، ئەم شێوازە دەکەن بە لوتکەو بایەخی پێ دەدەن، عەرەبەکان، ئینگلیزەکان، فەرنسەکان هۆلەندییەکان...هتد هەموو ئەمانە کۆمەڵێ زاریان هەیە، بەڵام یەك زمانی ستاندەر بۆ نووسین بەکار دەهێنن، من وای دەبینم کە زمان وەك درەختێك بێت و زارەکانیش وەك لقەکانی شێوازی ستاندەر وەك قەدەکەی یان بەرهەمەکەی بێ، بابای رەزەوان ساڵانە لقەکان لێ دەکاتەوە بۆ ئەوەی توانای درەختەکە پەرت نەبێت، و هەمووی ببێ بە بەرهەم چەند لقێك دەکاتە قوربانی بۆ بەری دارەکە، ئەگەر وانەکا کۆمەڵێ لقی پەرش و بڵاوی کەم بەرهەم دێتە ئاراوە، لەزمانیشدا دەبێ لە پێناو شێوازی یەکگرتوو قوربانی بە هەندێك لق بدرێ. ئەگەر نا کەس سوودمەند نابێ. هەر بۆیە زمان جگە لە دابەشکردنی بۆ چەند دیالێکتێك لە روانگەی (سیاسی) میرییەوە بە شێوەی تر دابەشدەکرێ.

## جۆرەکانی نەخشەی زمانی

ئەو وڵاتانەی کە زمانی ستانداردیان نییە، نەخشە و پلان دادەنێن بۆ زمانەکە تاکو بەو ئاراستەیەدا ببەن کە پێوستیانە وەك بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری و پەروەردەیی یان بۆ پتەوکردنی یەکێتی نیشتیمانی و هەستی نەتەوایەتی. (د. محەمەد مەعروف فەتاح)[1] رۆڵ و بایەخێکی تەواو دەدات بە کەلەپووری هاوبەش و بە بنەمای دادەنێ بۆ دانانی نەخشەی زمانی (مەبەستیش لە کەلەپوری هاوبەش بوونی چەند تایبەتیەکی کەلتوورییە -ئایینی، مێژوویی، یان

[1] د. محەمەد مەعروف فەتاح، رۆشەنبیری نوێ، ژ ١١٢، ١٩٨٦، ل١٢٥.

یاسایی- کە موڵکی هەموو خەڵکی وڵاتەکە بێت و، هەموو هاوبەشن تێدا، دەگرێتەوە) لەسەر ئەم بنەمایە سێ جۆرە نەخشە دیاری دەکات کە بریتین لە نەخشەی (ا، ب، ج).

### نەخشەی أ

ئەم جۆرە نەخشەیە بەکەڵکی ئەو وڵاتانە دێ، کە کاربەدەستەکانیان گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کە وڵاتەکەیان کەلەپووری هاوبەشی تێدا نییە، هیچ شتێکی ناوکۆ نییە کە ئەندامانی کۆمەڵگاکە کۆبکاتەوە. ناچار لە باری وادا دەبێ زمانێك لە دەرەوەی وڵاتەوە بێنن، بەتایبەتی زمانی کاربەدەستە داگیرکەرەکانی پێشوویان و وەك زمانێکی میری و نیشتیمانی بەکاری بێنن.

لەوڵاتی وادا کاربەدەستان تەنیا لەدوای ئامانجە ئیدارییەکانن، بەم ڕێگایەش تەنیا ئامانجە ئیدارییەکان دێتەدی، نەخشەی (أ) ئەو وڵاتانە بەناچاری بەکاری دەهێنن کە فرە هۆز و فرەنەتەوەن یان فرەزمان و فرەزارن کاتێ کە سەربەخۆیی وەردەگرن. زمانی میری نووسراویان نەبووە، بۆیە پەنا بۆ زمانی داگیرکەرەکان دەبەن. بۆ نموونە وڵاتانی ئەفریقیا وەك کامیرۆن و غینیای نوێ تا ئێستاش لەسەری دەرۆن.

ئەم نەخشەیە بۆ کورد دەست نادات، چونکە کورد کەلەپوری هاوبەشی هەیە و لەوەش گرنگتر زمانی هەیە، کە نووسینی لە هەموو بوارێکدا پێ دەکرێت. سەرەرای ئەمەش ئێمە لە نەخشەی زمانیدا مەبەستمان تەنیا بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری نییە: بەڵکو بەهێزکردنی یەکێتی نەتەوەیی و هەستی نەتەوایەتیە، ئەم نەخشەیەش ئەم ئامانجە ناپێکێ.



### نەخشەی ب

نەخشەی (ب) بە تەواوی پێچەوانەی نەخشەی (أ) ئەو وڵاتانە بەکاری دەهێنن، کە هاوڵاتیانیان هەست بەوە دەکەن خاوەنی کەلەپوری هاوبەشن و زمانێکی ناوکۆیان هەیە. ئەم زمانە هاوبەشە دەکرێتە زمانی میری و نیشتیمانی لە وڵاتدا بەمەش هەردوو جۆر ئامانجەکە، نەتەوەیی و ئیداری دێنێتە دی، نموونەی ئەم نەخشەیە لە سۆماڵ و تایلەند دا دەبینرێ. هەندێ وڵاتی تریش کە تاماوەیەك لەمەوبەر لەسەر نەخشەی (أ) دەرۆیشتن ئێستا کە بەرەو ئەم نەخشەیە دێن و دەیانەوی نەخشەی (ب) پەیڕەو بکەن، لەوانە ئەندەنووسیا و ئەنزانیا و فلیپین.

### نەخشەی ج

ئەم جۆرە نەخشەیە بەکار دێ لەلایەن ئەو وڵاتانەی کە زیاتر لە میرایەتی یان کەلەپورێکی هاوبەشی تێدا بیت، هەریەك لەمانەش زمانێك بەکاربێنن ئەرکی ئایینی و جوگرافی و کۆمەڵایەتی خۆیان هەبێت، بێگومان ئەم زمانانە دەکەونە بەربەرکانێی یەکتر و لەناوخۆیاندا هەریەکەیان دەیەوێ خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێ. لەباری وادا نەخشەی زمانی دەبێت، تەنیا هەوڵی هێنانەوەی یەك لە ئامانجەکانی بدات، کە ئەویش ئامانجە ئیدارییەکانە، نەك ئامانجە نەتەوەییەکان. هیندستان و نایجیریا لەو وڵاتانەن کە پەیڕەوی ئەم نەخشەیە دەکەن، لەم نەخشەیەدا میری بەهۆی زمانێکی دیاریکراوەوە خۆی دەگەیەنێتە خەڵکی یان زۆربەیان لەهەمان کاتیشدا سەربەستیەکی تەواو بەزار و کەمایەتیەکانی تریش دەدا، ئەمەشیان کێشەی زۆرری لێ دەکەوێتەوە، کێشەکەش زۆر جار بەوە چارەسەر دەکرێ کە شان بەشانی زمانێکی نیشتیمانی میری هەندێ جار دان بە زمانێکی تریش یان دوو زمانی ناوچەیی دادەنێ یا یەك زمانی ناوچەییان دەدرێتی لەو ناوچانەدا کە خەڵکەکەی بەکاری دێنن، نموونەی ئەمەش زمانی کوردی و عەرەبیە لە عێراقدا.

وا دەبینم ئێستا بارودۆخی زمانی کوردی بەشێوەیەکی سروشتی بەبێ نەخشە دانانی دیاریکراو کەوتۆتە سەر نەخشەی (ج) لەلای ئێمەدا. ئەمەش لەبەرئەوەی زمانی میری (پەرلەمان و ئەنجوومەنی وەزیران) بەزمانی کرمانجی ناوەراستەو کرمانجی ژووروش لە ناوچەی بادینان سەربەستیەکی تەواوی هەیە و زمانی میری لەم ناوچەیەدا بەکاردێت، ئەمە نەخشەیەکی لەباربوو بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی کە کولتوری جیاوازیان هەیە، وەك کوردو عەرەب لە عێراقدا نەك دوو زاری کوردی، چونکە خزمەتی ئامانجە نەتەوەییەکان ناکات و رەنگە بەرەو ئاراستەیەکی تری ببات کە لە دوارۆژدا دوو هەستی نەتەوایەتی جیاواز دروست بکات.

## پۆلینی سیاسی (میری) بۆ زمانەکان

لە نەخشەی زمانەوانیدا مەرج نییە، وڵات یان میری بەیەك چاو سەیری هەموو زارەکان بکات و وەك یەك بایەخیان پێ بدات. هەر وڵاتێك بە پێی ستراتیجی نەتەوەیی خۆی زار یان زمانەکان دەکات بە چەند پۆلێك کە هەندێکیان بایەخی تەواویان پێ دەدرێ و هەندێکیان بەکارهێنانی قەدەغە دەکرێت، ئیتر داهێنانی نوێی زمانەوانی کۆمەڵایەتی، بۆتە هۆی دابەشکردنەوەیەکی نوێی زمان بەپێی پلە و پایەی کۆمەلایەتی و ستراتیجی میری. لە جیاتی ئەوەی زمان دابەش بکرێ بۆ چەند زارو بەچکە زارێك، زمان ئێستا کە لە چەند شێوەیەکدا دەبینرێ[1]، کە ئەوانەن.

**١- تاکە زمان:**

ئەو زمانەیە کە تەنیا خۆی زمانی میری و نیشتیمانییە لە وڵاتدا، وەك زمانی عەرەبی لە زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکاندا هەروەها فەرەنسی لە فەرەنسادا.

[1]- د. محەمەد مەعروف فەتاح، رۆشەنبیری نوێ، ژ ١١٢، ١٩٨٦، ل١٢٥.



**٢- زمانی میری هاوبەش**

بەو زمانە دەگوترێ کە شان بەشانی زمانی میری و نیشتیمانی بەکار بێت، وەك فەرەنسی و ئینگلیزی لە کامیرۆن و ئینگلیزی و ئوردوو لە هیندستان، هەروەها بەپێی دەستوری عێراقی فیدراڵ کوردی و عەرەبی لە عێراقدا، بەڵام ئەمە تەنیا لەناو لاپەڕەکانی دەستوردایە و نەهاتۆتە دەرەوە.

**٣- زمانی میری ناوچەیی**

ئەو زمانەیە کە لەناوچەیەکدا پلەی زمانی میری و نیشتیمانی هەبێ یان بە ئەرکی ئەو هەڵبستێ وەك زمانی فەرنسی لە کیوبیك.

**٤- زمانی هاندراو**

ئەو زمانەیە کە هەرچەندە توانای زمانی میری و نیشتیمانی و ناوچەیی نییە. دەزگای راگەیاندن کەڵکی لێ وەردەگرێ لە دیدار و چاوپێکەوتن و هەندێ بەرنامەی رادیۆو تەلەفزیۆن دا بەکاری دەهێنن.

**٥- زمانی چاولێ پۆشراو**

ئەو زمانەیە کە دەزگای میری نەهانی دەدات، بۆ بەکارهێنانی و نەرێگاشی لێ دەگرێ، بەڵکو چاوی لێ دەپۆشرێ و هەقی بەسەریەوە نەماوە، وەك زمانی کۆچەرەکان لە ئینگلتەرادا.

**٦- زمانی قەدەغەکراو**

ئەو زمانەیە کە میری دانی پێدانەناوە و حەزناکا بەکاربێت، و هەوڵی ئەوەش دەدا نەهێڵێ قسەی پێبکرێ بە تایبەتی لە شوێنە گشتیەکاندا وەك زمانی کوردی لە تورکیادا.

## بەشی چوارەم (ڕێنووس)

### چەند تێبینیەک لە بارەی ڕێنووسەوە

بە پێویستی دەبینم چەند خاڵێك لە بارەی ڕێنوس بخەمەڕوو. ڕێنوس پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە زمانەوە نیە و ناچێتە ناو هیچ ئاستێکی زمان. ڕێنوس بەشێك نیە لە پێکهاتەی زمان، بەڵکو بریتییە لە وێنەی دەنگەکان و بەپێی ڕێکەوتنی کۆمەڵ وێنە بۆ دەنگەکان داڕێژراوە. بۆیە لەڕووی زانستی زمانەوانیەوە هەڵبژاردنی ڕێنوس گرنگی پێ نادرێ؟ بەهەر ڕێنوسێك بێ دەتوانرێ وشە و ڕستە کوردییەکان دابڕێژێ.

ئەو گرفتانەی ئەمڕۆ لە ڕێنوسی کوردی پیتی عەرەبیدا باس دەکرێ وەك دەرنەکەوتنی دەنگی بزرۆکەو یان پیتی تایبەتی بۆ نیمچە ڤاوڵی (w و y) لە ئەلفوبێی عەرەبیدا نییە. هەروەها ئەو گرفتانەی کە لە ئەلفوبێی لاتینی بەدی دەکرێ وەك نەبوونی پیتی (ع) و هەندێ دەنگی تر، کە لە چاو گرفتی ڕێنوسی زمانەکانی تر بە ڕێژەیەکە کە بەگرفت دانەنرێ. بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و عەرەبی و فارسی...هتد چەند گرفتێکیان لە ڕێنوسدا هەیە؟ تەنانەت وشەیەکی دیاریکراو دەشێ بەشێوەیەك زیاتر بخوێندرێتەوە. زمانێکی وەك ئینگلیزی و فەرەنسی...هتد ناچاربوون بۆ زانینی چۆنیەتی خوێندنەوەی وشەکانیان پشت بە ئەلفوبێی فۆنەتیکی جیهانی ببەستن transcriptiom. ئەمە نەك هەر لە زمانە ڕۆژئاواییەکان بەڵکو لە زمانێکی وەك عەرەبیدا، کەسێك ئەگەر شارەزای زمانەکە نەبێ، ئەوا وشەیەکی وەك (بر) دەشێ بەسێ جۆر بخوێنێتەوە و کە هەموشیان واتا داربن وەك (بَر- وشکانی) (بِر- چاکە) (بُر- دانەوێڵە).



بەدەگمەن ڕێکدەکەوێ نەتەوەیەك هەبێ ڕێنوسێك بەکاربهێنێ، کە لە بنچینەدا خۆی داینابێ. لەبەرئەوەی لە سەرتای دروستبوونی نووسین، ڕێنوس بەشێکی پیرۆز دادەنرا و، تایبەت بووە بەخواوەند و پیاوانی ئایینی. ئیتر ناشێ نەتەوەیەك لە کۆنەوە خۆی ڕێنوسی دابنێ، چونکە ئەو کاتە پیرۆزییەکەی نامێنێ کەرستەی خۆکرد هیچ کاتێك پیرۆز نەبووە. عەرەبەکان ئەو ئەلفوبێیەی بەکاری دەهێنن لە بنچینەدا ئەلفوبێی ئارامی بووە. تەنانەت ئەو ژمارانەی لە ڕۆژئاوادا بەکاری دەهێنن بەشێوەی (٤ ٣ ٢ ١) ئەمە بنەرەتی عەرەبییە. ئەوەی کە ئێمە و عەرەبەکان بەکاری دەیێنین (١ ٢ ٣) ئەو شێوەیەش لە بنەرەتدا هیندیە. بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر کوردیش ئەلفوبێی تایبەت بەخۆی نەبێ و لە بنەرەتدا خۆی دای نەڕشتبێ.

لەبەرئەوەی ڕێنوس پەیوەندی بە پێکهاتەی زمانەوە نیە و بۆیە بڕیاردان لەسەر هەڵبژاردنی ڕێنوس بۆ زمانی کوردی، زیاتر دەبێتە بڕیاریکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، نەك زمانەوانی ئەم بڕیارەش دەبێ لەسەر ئەم بنەمایانە هەڵبژێردرێ.

أ- ژمارەی چاپ و چاپەمەنی تا چ ڕادەیەك بە ڕێنوسی عەرەبی یان لاتینی چاپکراوە، لە ڕووی ئابوورییەوە دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ ئەو ئەلفوبێیەی کەمتر بابەتی پێ چاپکراوە فەرامۆش بکرێ، چونکە توانای دووبارە چاپکردنەوەیان زیاتر دابین دەبێ، بە پێچەوانەوە ئەو ئەلفوبێیەی کە کتێب و چاپەمەنی زۆری پێ چاپکراوە، توانای گۆڕینیان کەمتر دەبێ بۆ ئەلفوبێ. دووەم، لەبەرئەوەی بە پلەی یەکەم دەبێ پشت بەوە ببەسترێ کە کامە ئەلفوبێ بەرهەمی زۆرتر پێ نووسراوە، ئەو هەڵبژێردرێ. ئەوەش نیشانەیەکە بۆ ڕێژەی بڵاوبونەوەی ئەلفوبێیەکە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە.

ب- گەلێ کورد ئەمڕۆ کەوتۆتە ژێر کاریگەری گەورەی نەتەوەکانی دراوسێی تورك و عەرەب و فارس. ئەم کاریگەرییەش لە ڕووی ڕۆشنبیری و چاپ و

چاپەمەنیەوە بەشێوەیەکی فراوان بەدی دەکرێ. بۆ نموونە کوردەکانی باکوور کاریگەری تورکیان لەسەرە و کاریگەری عەرەبیان لەسەر نییە، چونکە ناتوانن ئەلفوبێیەکەی بخوێننەوە. بەهەمان شێوە کوردی باشوور کەمتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری بە تورك کردن، چونکە ئەلفوبێکەمان جیاوازە. لەبەرئەوە بڕیاری هەڵبژاردنی ئەلفوبێ بۆ سیاسیەکان جێ بهێلرێ، چاکترە کە ئەوان زیاتر ئاگادری بارودۆخی بە عەرەبکردن و بە تورك کردنن...هتد. جیاکردنەوەی ئەلفوبێ لەگەڵ هەریەکێك لەم نەتەوانە وەك ئەوە وایە کە دیوارێك لەبەردەم بە عەرەبکردن یان بە تورك کردن دروست بکرێ. بۆ نموونە ئەگەر سەرکردایەتی سیاسی کورد باوەڕی وابوو، کە هەڕەشەی بە تورك کردن زۆرترە و گەیشتۆتە ئاستێك کە مەترسی هەبێ، ئەوا چاکترە کار بۆئەوە بکا کە ئەلفوبێ عەرەبی لە نێو نەتەوەی کورددا بچەسپێنێ. ئەگەر باوەڕیشی وابوو، کە بەعەرەبکردن ترسناکترە و زاڵترە لەسەر نەتەوەی کورد ئەوا چاکترە کار بۆ سەپاندنی ئەلفوبێ لاتینی بکا. بە واتایەکی تر ئێمە ئەمڕۆ لەبەردەم کۆمەڵێ هەڕەشەداین هەڵبژاردنی ئەلفوبێ وەك دروستکردنی دیوارێك وایە لەبەردەم یەکێك لەم هەڕەشانە جا بڕیاردان لەسەر ئەوەی ئەم دیوارە لە نێوان گەلی کوردو تورکدا بێ یان لە نێوان کورد و عەرەبدا بێ. تەنیا دەشێ یەك دیواریش دروست بکرێ. بۆیە بڕیارەکە زیاتر پەیوەندی بە سیاسەتمەداران هەیە نەك زمانەوانان.

ئەم دوو بنەمایە گرنگن بۆ هەڵبژاردنی ڕێنوسێك و دەبێ لەبەرچاو بگیرێ. تا ئێستاش ئەم گفتوگۆیانەی دەکرێ لەسەر ئاستی تاکەکەس و هەندێك دەزگادا بووە میری بەرنامەی بۆ ئەم مەبەستە دانەڕشتووە، سەرەڕای ئەمەش لە کوردستانی باشووردا بەتایبەتی لە دەزگا ڕاگەیاندنەکاندا هەوڵدراوە کار بۆ هەردوو ئەلفوبێ بکرێ. شان بەشانی یەکتری ئەلفوبێی لاتینی و عەرەبی بەکاربێنن. لەکاتێکدا بوونی دوو ئەلفوبێ کارەکە ئاڵۆزتر دەکات و قەبارەی گرفتەکە گەورەتر دەکا. بۆیە وای دەبینم ئەگەر میری بەنیازە لەژێر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بڕیاری سەپاندنی ئەلفوبێی لاتینی بدا ئەوا چاکترە:



١- کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا لە هەموو بوارێك بەکاربهێنرێ وەك وەزارەت و فەرمانگەکان نووسراوی ڕەسمی پێ بنووسن.

٢- لە وەزارەتی پەروەردە و قوتابخانەکان بە چڕی بەکاربهێنرێ و قوتابی ناچاربکرێ کە لە تاقیکردنەوەکاندا بە ئەلفوبێی لاتینی وەڵام بداتەوە.

٣- بەپەلە کتێبی قوتابخانەکان وەربگێڕدرێتە سەر ئەلفوبێی لاتینی.

٤- ئەمانە تاماوەیەکی دیاریکراو لەداوای ئەم ماوەیەدا ئەلفوبێ عەرەبی قەدەغەبکرێ لەبواری فەرمیدا.

٥- دەزگای گەورە دابنرێ بۆ وەرگێڕانی هەموو ئەو کتێبانەی کە هەیە لە ئەلفوبێی عەرەبی بۆ لاتینی و دووبارە چاپکردنەوەیان.

ئەگەر میریش بەنیازە ئەلفوبێی عەرەبی بسەپێنێ، ئەوا پێویستە ڕێگا لە بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی بگرێ بەتایبەتی لە کەناڵە ئاسمانییەکان.

وەکو باسم کرد ناشێ دوو ئەلفوبێ لەیەك کاتدا لەناویەك نەتەوە بۆ یەك زمان بەکاربێ، بۆیە ناشێ بە نیشانەی دیموکراتی و عەولەمە، لێك بدرێنەوە. ئێستا وای دەبیم کە میری چارەسەرکردنی ئەم کێشانەی دابێتە دەست سروشت و خۆی بە خاوەنی نەزانێ، سروشتیش ڕەنگە پاش دەیان ساڵی تر چارەسەری بکا، ئەو کاتەش چارەسەرکە چۆن دەبێ ئەوا هەر سروشت خۆی دەزانێ ڕەنگە وەك پێشبینی دەکەم کورد ببێتە دوو زمان یان چاوەڕاون دەکرێ دوای دەیان ساڵی تر کە کێشەکە گەیشتە ئاستی زۆر بەرز و توانای بەرگەگرتنی نەما میری ئەو کات بکەوێتە خۆی و کە بە ئیمکانیاتێکی یەکجار زۆر بە ماندووبونێکی یەکجار زۆرتر و کۆمەڵێ گلەیی لە ئێستا ئینجا هەوڵی چارەسەرکردنی بدا. ئێستا کە گرفتەکە ساوایە بۆچی چارەسەر نەکرێ. ناشێ میری بەرنامە و هەڵوێستی نەبێ بەرامبەر بەو بابەتە چارەنوسسازانە کە نەتەوە و چەمکی نەتەوەی لەسەر بینا دەکرێ. تا ئێستاش لەلای ئێمە پارتە کوردییەکان بەرنامەیەکی سەرتاپایی نەتەوەییان نەوبووە. ناسیۆنالیزمی کوردی، تا ئێستاش بزووتنەوەیەکی

کاردانەوەیی بووە، کە گرفتەکان دەگاتە ئاستی بالاّ ئینجا بیری لیّ دەکاتەوە و هەموو توانای خۆی بۆ بەکاردەهێنیّ وانەبووە وەك گەلانی تر بەنامەیەکی دیاریکراوی هەبیّ لەسەر ئابووری نەتەوەیی زمان، بازرگانی، کانزا، ووزە و...هتد واتە بەرنامەی ستراتیجی دوورودرێژی نیە بۆ داهاتوو وەك بزووتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی.

## رێنووسی کوردی و شێوازی عەرەبی

هەموو نەتەوەیەك ئەلف و بێیەکی دیاریکراوی هەیە و لە هەموو بوارەکانی نوسیندا بەکاری دەهێنن، بۆ نموونە عەرەب و ئینگلیز...هتد ئێمە وەکو نەتەوەی کورد ئەلفو بێیەکەمان لە ئەلفو بێی عەرەبی دارشتووە. بەلاّم جگە لەو ئەلف و بێیەی کە بۆ نوسین بەکاری دەهێنن پەنا بۆ پیتی عەرەبیش دەبەین. بەتایبەتی ئەو پیتانەی کە لە کوردیدا نییە بۆ نموونە پیتی (ص ، گ ، ڤ، ژ، پ، چ) وەك لە ناوەکانی (صباح، گە، مڤفر کوپر، رچا) ئەم پیتانە لە ئەلف و بیّی کوریدا بوونیان نییە، کە چی بەکاریان دێنین، جگە لەمانەش ئێمە تا ئێستا ئەو ناوانە لە نوسینە فەرمیەکاندا بە شێوازە عەرەبیەکەی دەنوسین کەچی لە قسەکردندا بەکاریان ناهێنن، ئەمە لە کاتێکدا پێویست بوو کە زمانی نوسینمان کوردانەتر بووایە و کەمتر کاریگەری تەعریبی لەسەر بووایە لە زمانی قسەکردن، بۆ نموونە لە قسەکردندا هەمومان تاهیر بەکاردەهێنین کەچی لە نوسیندا بە تایبەتی لە ناسنامە و فۆرمە رەسمیەکاندا دەیکەین بە /گاهر/ ناوەکانی عبدوللا و نەسەڕدین و محەمەد ..هتد بە ئەلف و بیّ ی عەرەبی دەنووسین لە جیاتی پیتی کوردی ئەو پیتە عەرەبیانە بەکاردێنین کە لە کوردیدا بونیان نیە سەرەرای ئەمەش بە شێوەیەك دەیان نووسین کە سەر و بۆر و ژێرو زەنە بەکار دەهێنین کە چی ئەمانە لە ئەلف و بێی کوردیدا نامۆن واتە بەشێوەی عبداللە نصرالدین ، محمد دەیان نووسین.



ئەمانەش گرفتی بۆ ناونوسین و ریزبەندی ناوەکان بەپێیّ ریزی ئەلف و بیّو بەکارهێنانی فۆنت لە کۆمپیوتەر دروست کردووە. بۆ نموونە ناوی تاهیر لە لیستێکدا بە تاهیر بنوسریّ ریزبەندییەکەی جیاواز دەبیّ لەوەی کە بە( گاهر) بنوسریّ..هتد سەرەرای ئەمەش زۆر جار چاکردنەوەی فۆنتەکان لە بیر دەکریّ ناوەکان (طە ، مظفر، مصطفی، رضا) لەشێوەی (گە ، مڤفر، مصگفی، رچا) دەردەچیّ.

ئینگلیزەکان کە ناوی محەمەد دەنوسن دەنگی ح بە H دەنووسن نەك بە شێوەی عەرەبیەکەی یان عەرەبەکان کە ناوی بیانی بەکاردەهێنن وەك: ( گۆرگی ، ڤیکتۆر هیگۆ، ژیڤاگۆ) ئەوا بەپێی ئەلف و بیّی خۆیان دەینوسن . هەر ئەو ئەلف و بێیە بەکاردەهێنن کە هەیانە بۆیە ئەو دەنگانەی لە ئەلف و بێیەکەیاندا نییە بە دەنگێکی تر زمانەکەیان دەیگۆڕنەوە نەك پیتی نویێ بۆ دروست بکەن، وەك ئێمە دەیکەین. بۆیە دەبینین ئەم ناوانە بەم شێوەیە دەنووسن و دەیکەن بە: (جورجی، فیکتور هیجو، زیفا کو یان جیفاکو) بەلاّم ئێمە تا ئێستا ناوە عەرەبیەکان بە ئەلف و بیّی عەرەبی دەنوسین و ناوە کوردییەکانیش بە ئەلف و بیّی کوردی دەنوسین.بۆ نموونە ناوی (محەمەد) بە شێوەی (محمد) دەنوسین. ئەمە رەنگە ئەگەر بە سەرپێیی سەیری بکەی بایەخی پیّ نەدریّ بە گرفت لە قەلّەم نەدریّ بەلاّم لە راستیدا گرفتی لیّ دەکەوێتەوە و کۆمەلیّ پرسیاری بیّ وەلاّممان لەلا دروست دەکا ، لەوانە:

١- لە ریزبەندی ناوەکاندا گرفت دروست دەکا وەك لە سەرەوە باسکرا.

٢- لە رووی رێنووسەوە باوەرمان وایە کە نوسین بەم کلێشە عەرەبییە هەلّەیە و لە زمانی کوردیدا (محەمەد) نابیّ بە شێوەی (محمد) ی عەرەبی بنوسریّ، چونکە لە ئەلفوبێی کوردیدا (سەر، بۆر، ژێر، زەنە) نییە.

٣- کۆمەڵێ پیتی عەرەبی هێناوەتە ناو ئەلفو بێی کوردی کە بەشێك نیین لە ئەلفو بێیە کوردییەکە لەوانە(ڤ، گ، چ، ص، پ، ..هتد) . ئایا ژمارەی پیتەکانی ئەلفو بێی کوردی چەندن؟ ئایا ئەمانە دەچنە ناو لیستی پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی ؟ بێ گومان نەخێر.

٤- بۆچی تەنیا ئەم دیاردەیە لە ناوەکاندا بەدی دەکرێ؟ خۆ دەیان وشەی تری زمانی عەرەبی هاتۆتە ناو زمانی کوردی کە دەنگی ناکوردی تێدایە بەلاّم لە نوسینی کوردیدا بە دەنگی خۆماڵی دەیگۆرینەوە ناوەکانی صومال، مصر، قصیدة. طماطة، فاصولیا، مفاوضات، ریاض (پایتەختی سعودیا)، رمضان ...هتد بە شێوەی (سۆماڵ، میسر، قەسیدە، مفاوەزات، ریاز، رەمەزان) دەنوسین بەلاّم کە ناوی مرۆڤ بێ ئەوا دەبێ وەکو عەرەبەکان بینوسین.

٥- بۆچی ئەم دیاردەیە تەنیا بۆ ناوی عەرەبی بەم شێوەیەیە؟ کاتێك ناوێکی بیانی جگە لە عەرەبەکان بۆنموونە ناوێکی وەك Elizabeth، Kathrinی ئینگلیزی بە شێوەی (ئیلیزابیث، کاپرین) نانوسین و دەیکەیەین بە (ئەلیزابێت، کاسرین یان کاترین).

چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە گرفتێکی ئەوەندە گەورەنیە. پێویستی بە کات و ئیمکانیاتی زۆر نییە تەنیا وەستاوەتە سەر گشتاندنێك کە دەسەلات (میری) دەری بکات بۆ هەموو دەزگاکانی هەرێم کە لەمەودوا هەموو ناوێك بە شێوە کوردییەکەی بنوسرێ بە تایبەتیش لەناسنامەی باری شارستانی لە مەودوا بەشێوە کوردییەکەی ناو تۆمار بکەن لە دەزگاکانی تریشدا کاری پێ بکرێ و بەرەبەرە دەبێتە دیاردەیەکی ئاسایی.



**ریزبەندی پیتەکان:**

گرفتێکی تر کە رێنوسی کوردی هەیەتی ئەوەیە ریزبەندیەکی چەسپاو بۆ پیتە کوردییەکان نییە، دەبێ لە نووسین و دروست کردنی لیستەکاندا پشت بە ریزبەندی ئەبجەدییەوە یان هیجایی عەرەبی ببەستین، تا ئێستاش زۆربەمان ریزبەندی ئەلفوبێی عەرەبی و ئینگلیزیان لەبەرە و دەزانین کامەیان لەدوای کامەیان دێ بۆ نموونە b پیتی دووەمە و پیتی z پیتی کۆتاییە هتد، بەلاّم لە کوردیدا نازانین گ یان ژ یان ڤ هتدد چەندەم پیتی کوردییەو لە داوای کام پیتەوە دێن تەنانەت لە کۆمپیتەریشدا ئەم فۆنتانەی کە بۆ زمانی کوردی دانراوەن ریزبەندییەکەیان وەکو یەك نییە بۆ ریزکردنی تۆماتیکی یان فەرەز sort کردنی لیستێکی ناوی کوردی لە فۆنتێکەوە بۆ فۆنتێکی تر دەگۆڕێ. چارەسەرکردنی ئەم گرفتەش سادەیە و بە بڕیارێك و گشتاندنی بڕیارەکە لەلایەن دەزگایەکی وەك کۆڕی زانیاری چارەسەر دەکرێ.

**ناوی پیتەکان**

ئەوەی سەرنج راکێشە تا ئێستا کەسمان ناوی پیتەکانی خۆمان نازانین. کە دەڵێم ناوی پیت جیاوازە لەگەڵ دەنگی پیت بۆ نموونە لە عەرەبیدا پیتی (ا) دەنگی /I/ دەردەبڕێ بەلاّم ناوەکەی (ئەلف)ە هەروەها پیتی (و) ناوی هەمزەیە و دەنگی (و) دەنوێنێ، لە ئیگلیزیدا پیتی (H) دەنگی ه دەردەبڕێ و ناوی ئێچە.

ناوی پیت جیایە لەگەڵ دەنگی پیتەکان بۆ نموونە کە ناو لە (و) هەمزە نراوە هەمزە. ئەم ناوە هیچ پەیوەندیەکی بە دەنگەوەکە نیە تەنانەت دەنگی (و) لە هەمزەدا نییە.

لە کوردیدا تا ئێستا پیتەکان ناویان نییە. کاتی خۆی لە حوجرەکاندا مەلاکان بە کاریگەری زمانی فارسی ناویان بۆ ئەلفوبێی کوردی دانابوو بە فەقێیەکانیان دەگوتەوە. واتە لە جیاتی ئەلفوبا جیم دال هتد عەرەبی پێیان دەگوتن ئەلف بێ

تێ حێ...هتد. ئەم ناوانە تەنیا بۆ ئەو پیتە عەرەبیانە بوون کە لە زمانی عەرەبی و خوێندنی حوجرە بەکاردەهاتن. ئەوانیش بەشێوەیەك کە دەنگی کۆنسنتەکان و دەنگی (ێ) یان لە کۆتاییدا بۆ زیاد کردبوون. ئەو پیتانەی تایبەت بە زمانی کوردین. وەك (گ ڤ ژ) لە نێوانیاندا نەبوو سەرەڕای ئەمانەش ڤاوڵە کوردییەکان ئێستاش نازانرێ ناویان چیە. جگە لە ڤاوڵی (i) نەبێ کە ناونراوە بزرۆکە بۆ نموونە ڤاوڵی (ا، و، ی، ێ، ۆ... هتد) ناویان چیە؟

منالان هەر لە سەرەتاییەوە بە ئاواز و گۆرانی پیتەکانی ئینگلیزی (A B C D) و پیتەکانی عەرەبی (ئەلفوبا تا) فێر دەبن و تەنانەت لە هەندێ یاریکردندا بەکاری دەهێنن، بەڵام ئەلفوبێی کوردی نازانن، نەك هەر منالەکان بەڵکو گەورەکانیش نایزانین، نەبوونی ناوی پیتەکان گرفتی لێ کەوتۆتەوە و لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بوونیان زۆر گرنگە. چونکە بەکارهێنان زۆرە و لە داهاتوودا زۆر تریش دەبێ با لە هەندێ نموونە رابمێنین (بەتایبەتی لە بواری کورتکردنەوەدا Abrevation یان Acronime). بۆ نموونە ریکخراوی (ژێکاف) کە لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوو هەبوو ناوەکەی کورتکراوەی ژیانەوەی کورد، کورتکراوەی لە دوو پیت پێکهاتووە کە لەسەرەتای وشەکاندا وەرگیراوە. (ژ.ك). دەربڕینی ئەمە بوو، کە بووە بە (ژێکاف) بە شێوەیەك کە نیوەی بەناوی کوردی و نیوەکەی تریش عەرەبیە. چونکە (ژێ) دەربڕینێکی کوردییە (وەك شێوەی حوجرەکان) و (ك) بەشێوەی کێ دەرنەبڕاوە بەڵکو بە کاف وەك عەرەبەکان دەرە دەبرن. P.k.k چۆن دەخوێنریتەوە وەك پەکەکە (پی کەی کەی) (پێ کێ کێ) (پێ کە کە) دەبینین دەنگی /k/ لە کوردیدا سێ ئەگەری هەڵگرتووە (کە، کێ، کەی) نەك تەنیا ئەم دوو نموونەیە سەدان ناوی رێکخراو پارت و دەزگا...هتد دەشێ بۆ ئەم گرفتە وەك نموونە بهێنینەوە.

لە رۆژگاری ئەمڕۆدا کە بەسەردەمی خێرایی ناودەبرێ و پەنا بۆ کورتکردنەوەی ناوەکان بە رێژەیەکی فراوان دەبردرێ. بەتایبەتی لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیدا. کورد کەمتر دەتوانێ سوود لە کورتکردنەوە ببینێ بەشێکی بۆ



هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە کە پیتەکانمان ناویان نییە و پێی ئاشنا نەبووین، گەلی کوردیش بەرێژەیەکی زیاتر ئارەزووی کورتکردنەوە دەکا بە بەڵگەی ئەوەی کە ناوی مرۆڤ لە چاو گەلانی دەوروبەری کورتتر دەکاتەوە.

بەم بارەی ئێستای ئەلفوبێی کوردی کە پیتەکان ناویان نییە، سەدان کورتکراوە دروست بووە لە داهاتووشدا یاسای وزەپاراستن و جەنجەڵی ژیان و خێرایی رۆژگار بەسەرماندا دەسەپێنێ کە بەهەزاران ناوی تر کورت بکەینەوە. لەبەرئەوە بۆ وشەیەکی وەکو پێشمەرگە نەڵێین (پێ میم) کە (میم)ەکەی عەرەبییە و (پێ)یەکەی کوردییە. پێویستمان بەوە دەبێ ناو لە پیتەکانمان بنێین. ئەم گرفتە لە هەردوو جۆری ئەلفوبێیەکەدا عەرەبی و لاتینی بەدی دەکرێ و هیچ جیاوازییەکیان نییە بۆ نموونە دەنگی (ا) چ بە شێوە لاتینیەکەی کە (A) یە یان بەشێوە عەرەبییەکەی کە (ا) یە هەمان گرفتیان هەیە. واتە ئەو ناوانەی لە پیتەکان دەنرێ دەشێ بۆ هەردوو ئەلفوبێ بەکاربێ.

چارەکردنی ئەم گرفتەش پێویستی بە کۆنفراسێکی تایبەتی هەیە، کە ژمارەی ئەندامانی کەم بێت، و چەند کەسێك لە شارەزایانی زمان و پسپۆران بانگهێشت بکرێن، چەند ئەندامێکی بەشەکانی تری کوردستانیش تێدابێت. دوو رۆژ یان سێ رۆژ کۆببنەوە بە پێی قەناعەتی خۆیان بڕیار لەسەر ناوی پیتەکان بدەن. لە دوایشدا وەزارەتی پەروەردە لە قوتابخانە سەرەتاییەکان پیادەی بکات. دەزگا رۆشنبیری و شاعیرانیش بە شێوەی هۆنراوە دایبرێژن و بکرێ بە گۆرانی بۆ منالان بەرەبەرەش لە دەزگا راگەیاندنەکاندا کورتکراوە نوێیەکان بە کاربهێنرێ لە ماوەیەکی کەمدا ئاشنایەتی پەیدا دەکات و، خەڵك فێری دەبێ. پێویستە تێبینی ئەوەش بکری کە ئەو ناوانەی بۆ پیتەکان دادەنرێ، کۆتاییەکەیان وەك ئەوەی هەیە کە هەمووی بریتی نەبێ لە دەنگی ڤاول (نەبزوێن). لەسەر ئەو بنەمایە ناویان لێ بنێین کە لێکدانیان ئاسان بێت، و بواری لێکدانیان فراوان بێ، بە تایبەتی لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت دا لە داهاتوو زۆر تر کاری پێ دەکرێ.

## چەند پێشنیارێکی تر

جگە لەم بابەتانەی خستمانە روو، بۆ بایەخدان بە زمانی کوردی پێویستە میری کۆمەڵێ پرۆژە و پلانی هەبێت، کە کاریگەریان لەسەر ئاستی زمانەکە دەبێت، و پلەو پایەیەکی تری پێ دەبەخشن. لەوانە:

١- دانانی دەزگای وەرگێڕان کە کتێب و سەرچاوەی نوێ وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی، بابەتەکانیش لەهەموو زانستێکدا بێت، و تەنانەت سەرچاوە زانستیەکانیش وەربگێڕن، ئەم دەزگایەش دەشێ داوا لە کەسانی پسپۆر بکا لە بوارە جیاجیاکاندا بۆ وەرگێڕانی کتێبەکان بەرامبەر بە پارەیەکی شایستە لە کاتێکی دیاریکرودا، ئەگەر وەرگێڕیش توشی گرفتی وەرگێڕانی زاراوە بوو، ئەوا دەزگای وەرگێڕان بەهاوکاری کۆڕی زانیاری ئەو زاراوانەی بۆ دابتاشن و هاوکاری بکەن.

٢- بایەخدان بە زمانی کوردی لە وڵاتانی تردا، بە تایبەتی لە ئەورووپا و ئەمریکا، هەوڵبدرێ بەشی زمانی کوردی لەم وڵاتانەدا بکرێتەوە و بەڕێوەبردنیشی لە رووی دارایی و دابین کردنی مامۆستا لەئەستۆی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بێت. ئەمەیان لە دوارۆژدا کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت، لەسەر لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی خەڵکانێك هەن پێویستیان بە فێربوونی زمانی کوردییە بە تایبەتی بۆ بواری بازرگانی و دبلۆماسی و...هتد یان لەو بەشانەی رۆژهەڵاتناسی و زمانە ئێرانیەکان دەخوێندرێ زمانی کوردی بایەخی زیاتری پێبدرێ و بکرێتە بەشی سەربەخۆ.



٣- لەدوای دەرچوونی دەستوری عێراقی، زمانی کوردیش لە عێراقدا بە زمانی رەسمی دانرا ، بۆ ئەوەی ئەم بڕیارە تەنیا وەك مەرەکەبی سەرکاغەز نەمێنێتەوە، ئەوا پێویستە میری بایەخ بە گوتنەوەی وانەی زمانی کوردی بدا لە شارەکانی تری عێراقدا، بە لایەنی کەمەوە لەهەر شارێکدا لە یەکێك لە قوتابخانەکانیدا بە تایبەتی قوتابخانەی نموونەیی، ئەگەر هەبێ وانەی زمانی کوردی تیدا بخوێندرێ، لە داهاتووشدا رێژەکە فراوانتر بکرێ.هەرچەندە بارودۆخی ئێستا بۆ ئەم هەنگاوە لە بار نییە، بەڵام پێویستە میری بیری لێ بکاتەوە لە دوارۆژدا بە پێی دەستوور بیسەپێنێ. جگە لەمە پێویستە میری بیر لەوە بکاتەوە و لە بەرنامەدابێ، کە ئەگەر بەشەکانی تری کوردستان بارودۆخی سیاسیان گۆڕا یان بەلایەنی کەمەوە مافی خوێندنی کوردییان پێبەخشرا (کە ئەمەش شتێکی چاوەڕوانکراوە) ئەوا دەبێ لێرەوە (هەرێمی کوردستانی عێراق) مامۆستاو شارەزایانی زمانی کوردی بۆ سەدان قوتابخانەی بەشەکانی تری کوردستان (کوردستانی ئێران یان کوردستانی تورکیا) بنێرێ. بۆ ئەم بوارەش کادیری ئەو زمانە یەکگرتووە دروست بکا تاکو بەشداری بکەن لە دانانی پرۆگرامەکانی خوێندن و دەرس گوتنەوە بەمەش لە بەشەکانی تریشدا زمانە یەکگرتووەکە بچەسپێ.هەر وەك لە جەزائیر رویدا لە دوای رزگار بوونی لە دەست داگیر کەر

٤- کردنەوەی دەزگایەکی تایبەت بۆ فێربوونی زمانی کوردی بە تایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە کوردنین و یان کوردی نازانن و لە کوردستان دەمێننەوە، بۆ نموونە کۆمەڵێ قوتابی تورکیا یان سوریا...هتد لە زانکۆکانی کوردستان دەخوێنن، تووشی گرفتی نەزانینی زمانی کوردی دەبنەوە، دیاردەیەکی

ئاساییە لە هەموو ولاتێکدا بۆ قوتابیانی بیانی خولی فێربوونی زمان هەیە، بۆ هەموو ئاستێك لە ساڵی یەکەمدا یان شەش مانگی یەکەمدا قوتابییەکە فێری زمان دەکرێ، ئینجا رێگای پێ دەدرێ بچێتە زانکۆوە، ئێمەش پێویستیمان بە دەزگایەکی لەو بابەتە هەیە، نەك هەر تەنیا بۆ قوتابیان بەڵکو بۆ ئەو مامۆستاو پزیشك و ئەندازیار...هتد عەرەبانەی کە دێنە کوردستان و لێرەدا کاردەکەن لە پشووی هاوینە بۆ مامۆستایان و لەکاتی گونجاوی تردا بۆ پیشەکانی تر بنێرنە خولی فێربوونی زمانی کوردی. تەنانەت دەرچوون لەم خولانەدا بکرێنە مەرج بۆ کارکردن و مانەوەیان لە کوردستاندا، یان وەرگرتنیان لە زانکۆکانی کوردستان.

٥- خوولی تایبەت بە فەرمانبەران بکرێتەوە بۆ ئەوەی شارەزابن لە داڕشتنی نووسراوی فەرمی بە کوردییەکی رەوان یان هەوڵبدرێ شێوەی کلێشەی نووسراوی رەسمی بەهەموو جۆرەکانیەوە و لە هەموو فەرمانگەیەك ئامادە بکرێ بۆ ئەوەی لەسەرتاسەری کوردستاندا نووسراوە رەسمییەکان بەیەك شێوە بن ئێستا فەرمانبەرێك داوای مۆڵەت یان پشتگیری...هتد، دەکات لەهەر فەرمانگەیەکدا بەشێوەیەکە و داوکار بەسەلیقەی خۆی دەینوسێ. پێویستە ئەمانە کلێشەی چەسپاو دیاریکراوی یەکگرتوویان هەبێ، لەسەرتاسەری کوردستاندا وەك یەك بێت،، زۆرجار نووسراو کراوە، ئەوەندە ئاڵۆزە ناتوانرێ بەئاسانی تێ بگەین. تەنانەت هەندێ جار تەمومژی واتایش دروست دەکات. جگە لەمانەش پێویستە لە بەڕێوەبەرایەتیەکاندا شارەزایەکی زمانی کوردی هەبێت. بەسەر ئەو نوسراوانەدا بچێتەوە کە کلێشەیان نیەو نوسراوی تایبەتین، هەروەها چاکترە ئەگەر ئەو لیژنە یان دەزگایەی کە کلێشەکان دادەڕێژێ بۆ ماوەی ساڵێك یان شەش مانگ دوای دەرچوونی کلێشەکان ئامادەبن بۆ ئەوەی هەرکەسێك یان دەزگایەك کە گرفتی نووسراو و زاراوەی ئیداری و یاساییان هەبێ، ئەوا پەیوەندییان



پێوەبکەن و گرفتەکەیان بۆ چارەسەر بکەن، جا چ بەرێگای پۆستە بێت، یان پەیوەندیکردنی راستەوخۆ بە تەلەفۆن بۆ کاری بەپەلە. تا ماوەیەك دەکەوێتە سەر سکەی سروشتی خۆی.

٦- یەکخستنی زاراوە کارگێرییەکان بە فەرمانێکی ئەنجوومەنی وەزیران، چونکە ئێستا هەر فەرمانگەیەك بەشێوەیەك بەکاری دەهێنێ. بۆ نموونە زاراوەی (الصادر والواردە) بەکۆمەڵێ شێوە دەبینرێ، لەوانە (وەرگرتەو دەرکردە)، (هاتوو رۆیشتوو)، (هاوردە دەرکردە)...هتد.

٧- لە کەناڵەکانی راگەیاندندا یەك ئەلفوبێی بەکاردێت و هەوڵبدرێ بەیەك زار بەرنامەکان پێشکەش بکرێ.

٨- رێزمان قوتابخانەکان بکرێ بەیەك رێزمان و لەسەرتاسەری کوردستان وەکو یەك بێت، بەتایبەتی لە قۆناغەکانی ناوەندی و ئامادەیی، پێویستە دەسکارییەکی تەواو بکرێ، چونکە ئەو بابەتانەی کە لەرێزماندا دەیان خوێنن دەمێکە ئێکسپایەر بووە.

٩- بایەخدان بە کۆڕی زانیاری و دروستکردنی سەنتەر و رێکخراوی زمان وسەندیکای زمانەوان و... هتد.

## سەرچاوەكان


١- د. ئەورەحمان حاجی مارف، رابەری سەرچاوە لە بارەی زمانی كوردیەوە. بەغدا، ١٩٨٩.

٢- تۆفیق وەهبی، دستور زمانی كوردی، بەغدا، ١٩٢٩.

٣- جەمال نەبەز، زمانی یەكگرتوی كوردی، بامبێرگ، ١٩٧٦.

٤- سەعید سدقی كابان، مختصر صرف و نحوی كوردی، بەغدا، ١٩٢٧.

٥- الشیخ محمد خضری بك، محاضرات في التاریخ الدولة الامویة، تحقیق: السیخ محمد العثماني، بیروت، ٢٠٠٠.

٦- د. عەبدوڵڵا پەشێو، چەند سەرنجێكی سەرپێی دەربارەی میدیاو زمان، رۆژنامەی میدیا، ژمارە ٩١، رێكەوتی ٢٠٠١/٤/٧.

٧- فلوریان كولماس، اللغة والاقتصاد، ترجمة: د. احمد حوض، ٢٠٠٠.

٨- فوئاد حەمە خورشید، زمانی كوردی دابەشبوونی جوگرافیای دیالێكتەكان، ١٩٨٥.

٩- محەمەد مەعروف فەتاح، رۆشەنبیری نویێ، ژ ١١٢، ١٩٨٦.

١٠- محەمەد مەعروف فەتاح، محازەرەیەكی خوێندنی بالاّ، ٢٠٠٠.[١]

١١- د. نایف خرما، اضواء علی دراسات اللغویة المعاصرة، عالم المعرفة سلسلة ٩، طبعة الثانیة، ١٩٧٩،.

١٢- یولیوس فلهاوزن: تاریخ الدولة العربیة الاسلامیة من ظهور الاسلام الی نهایة الدولة الامویة، نقلة من المانیة د. محمد عبدالهادي ، راجع الترجمة، د.حسین مؤنس، القاهرة، ١٩٥٨.

١٣- ........................ فقه اللغة العربیة، ١٩٨٧.

١٤- رۆژنامەی بانگە حەق، ژمارە ١، ١٩٢٣.

١٥- Jukil Ali Mahmood, The process of Standardization with reference to English and Kurdish, Univeresty of Salahadin , ٢٠٠٤